ناوی کتێب : مرۆڤ و ژیان
نوسەر : کاروان سلێمان کاکەمەد
بابەت : لێکۆڵینەوە
بەرگ : شەشەم
تایپ : نوسەرخۆی
نرخ : دیاری یە
دیاری یە بۆ /......................
بەرواری :   /   /

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپارد
نی (٦٧٣)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە.

**لەبارەی هاوسەرگیری و ژیانی خێزانی :**

**مێژووی هاوسەرگیری بۆهەردوو مرۆڤی یەکەم دەگەڕێتەوە (ئادەم و حەوا) ، پەیمانێکی کۆ مەلأیەتییە٠**

**(ع) دەڵێ : ((ئەگەرهاتوو ژن و مێردێك هەموورۆژێك شەڕوئاژاوەیان بوو ، ئەوابەبۆچوونی من لێکجیاببنەوە باشترە ، چونکە بەجیابوونەوەیان کۆتایی بەوکێشە بەردەوامە دێت٠بەلأم نابێ منداڵەکان بکرێنە قوربانی واتا هیچ کام لەژن و مێردەکە نابێ منداڵەکانیان بێ بەش بکەن لەسۆزوخۆشەویستی دایك و باوکیان))٠**

**(ع) دەڵێ : ((پیاوشەرم دەکات ئەگەرهاتوو خەڵك بزانێ کێشەی خێزانی هەیە ، بەلأم ئافره ت نا ، کاتێك کێشەیەکی هەبێ لەگەڵ مێردەکەی باسی دەکات جا لەگەڵ دراوسێی بێت یان لەگەڵ هاوڕێیەکی بێت یان لەگەڵ دایك وئەوانەی))٠**

**(م) دەڵێ : ((ئەوئافرەتانەی توندوتیژییان لەگەڵ بەکاردێ باهەوڵ بدەن خۆیان چاك بکەن بۆئەوەی توندوتیژی لەسەریان نەمینێ))٠**

**(ب) دەڵێ : ((هەندێك جارئافرەت لەمەهانەوگێچەڵ دەگەڕێ بەمەش هانی پیاوەکەی دەدا ت توندوتیژی لەبەرامبەری بەکاربێنێ))٠**

**(ی) دەڵێ : ((لەدایکبوونی منداڵێکی تر لەخێزاندا لێرەدامنداڵی یەکەم هەست بەگوێ پێنه دان دەکات و ئیرەیی بۆ دروست دەبێ ، دەبێ لەڕووی پێبەخشین دا هاوسەنگییەك لە نێوان منداڵەکاندا دروست بکرێت دەبێ لەچیرۆکی حەزرەتی یوسف و براکانی دا پەند وەربگیرێت کەوایان هەست دەکرد یوسف (علیه السلام) لەهەموویان خۆشەویسترە))٠** {إذ قالوا ليوسف وأخوه أحب الى أبينا} يوسف : ٨

**(ی) دەڵێ : ((هەمیشەدەبێ دایك شتێك کەزیانی بۆمنداڵەکەیان هەیە دەکەوێتە بەردەستی قابیلی شکانە دەبێ دووری بخاتەوە لێی ، چونکە منداڵ نازانێت چ زیانی هەیە دەبێ قاندر مەکان بگیرێت و پلاك و سویچی کارەبا ئەگەردابەزێنرابوون بکوژێنێتەوە ، چونکە منداڵ دەتوانێت دەستی بیانگاتێ دەبێت شوورە و دیواری بەربەستی بەلەکۆنەکە بەئاستێك بەرز بێت ، کەمنداڵ هەڵنەگەڕێت پیایدا بۆیە دەبێت ئەوشوورەیە بەرزبێت))٠**

**(س) دەڵێ : (( هیچ کێشەیەکم لەگەڵ هاوسەرەکەم نەبوو ، تەنیا ئەوەنەبێ گومانی خراپ لەنێوانمان دا هەبوو هێندە گومانی خراپ و دڵپیسیم بەرامبەر هاوسەرەکەم کرد تاوەکوما**

لم كاول بوو ، شەوان کەمێردەکەم دەنووست مۆبایل و لاپتۆپەکەم دەپشکنی))٠

(ك) دەڵێ : ((ژنەکەم هێندە لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکات لەکوێ بووی ؟ لەگەڵ کێ بووی ؟ بێ ئەوەی باوەڕ بەجوابەکانم بکا))٠

(م) دەڵێ : ((لەم سەردەمەدا نەفامی گەیشتۆتە ئەوئاستەی لەولاّتانی ڕۆژئاوا خەڵك هاوسە رگیری لەگەڵ سەگ و مەیموون و گوێدرێژ دەکات و میرات بەپشیلە و مەیموون دەدەن))٠

(د) دەڵێ : ((ئافرەتی واهەیە ئیسراف لەماڵ دەکات ئەم پیاوە شەوو ڕۆژ دەڕوات لەبەرگەر مای هاوین و سەرمای زستان کاروکەسابەت دەکات ئەویش ئەوماڵە بەهەدەردەدات))٠

(م س ن) دەڵێ : ((لەپرۆسەی هاوسەرگیری پەیوەندی خزمایەتی دروست دەبێ ، کەپەیوە ندییەکی پشتی نییە ، بەڵکو پەیوەندییەکی نزمترە ، لەهاوسەرگیری : خاڵ و پورو کوڕە پورو کچەپوور ٠٠٠تاد دروست دەبێ))٠

(ع) دەڵێ : ((لەهاوسەرەکەم جیابوومەتەوە بەشێك کەم وکوڕی منیشی تێدایە ، بەلاّم هەر گیزتوندوتیژیم بەرامبەری نەکردووە یانی لێدانم بەرامبەری بەکارنەهێناوە ، هەمیشە زۆ ربەهێمنی و لەسەرخۆیی وەلاّمم داوەتەوە ، بەلاّم منیش کەم وکوڕیم هەبووە))٠

(م) دەڵێ : بەڕاستی ژن لەدنیادا ئەگەرخراپ و ناپەسند بێت ئەوە ناخۆشی و تاڵی ژیانە بۆ ئینسان ، ئەوشتانەی وادەکات ژیانی مێردەکەی تاڵ بکات ئەمانەن :-

١ – ژنەکە بەگوێی پیاوەکە نەکات٠

٢ – ژنەکە زمان درێژبێت٠

٣ – ژنەکە گرینگی بەپیاوەکەی نەدات٠

(ع) دەڵێ : ((ئەگەرکەسێکت بەدڵ نەبوو بەجوانی وەلاّم بدەوە دڵی خەڵك نەڕەنجێنی ، ئە گەرکەسێکیش هاتەداخوازیت وئەوتۆی بەدڵ نەبوو دلگران مەبە ، چونکەکەس نازانێ خێر لەچی دایە ، هەرخواخۆی دەزانێت))٠

(ع) دەڵێ : ((لەبەرئەوەی ژیانی خێزانی بۆڕۆژێك ودووان نییە دەبێ ڕاستگۆبی لەگەڵ ئەو کەسەی ژیانی خێزانی لەگەڵ دروست دەکەی ، سروشتت چۆنە ؟ چ نەخۆشییەکت هەیە ئە وانە بۆکوڕەکە باس بکەی))٠

(گ) دەڵێ : ((من لەوبڕوایەدام کچی قوتابی ، کەقۆناغەکانی خوێندنی تەواوکرد ئینجاشوو

بكات باشترە ، بەلاّم كچی ماڵەوەهەركاتێك شووی كرد بابیكات))٠
(ق) دەڵێ : ((مەسەلەی شووكردن تەمەنی دیاریكراوی نییە ، بەڵكوپەیوەستە بەڕێككەوت جائەوڕێككەوتە ئایاتەمەنی (٢٠) ساڵییە یان تەمەنی (٢٥) ساڵییە))٠
(ت) دەڵێ : ((لەكاتێكدا لەماڵی باوكم بووم ژیانێكی خۆشم هەبوو لەگەڵ دایكم و باوكم بە هاران دەچووینەدەرەوە ، جنێوم نەدەبیست ، گرفتی ژیانم نەبوو ، بەلاّم پاش شووكردن ژیا نم وەك دۆزەخی لێهاتووە ڕۆژێكی خۆشم نییە هاوسەرم بڕوای بەچوونە دەرەوە وپیاسەكر دن نییە تەنانەت هەندێك جارتوندوتیژیش دەنوێنێت))٠
(ل) دەڵێ : ((دووساڵە ژیانم وەك جەهەننەمی لێهاتووە دایمەن شەڕوبۆڵەبۆڵە))٠
(ف) دەڵێ : ((بەسەرخۆشی هاتنەوەی مێردەكەم و هاواركردن و لێدان ٠٠٠))٠
(ع) كوڕێكە دەڵێ : ((پێشترئیشم هەبوایە نەبوایە بەلامەوە گرینگ نەبوو ، خەمی كرێی خانووم نەبوو ، نەوت ، ئاو ، كارەبا))٠
(ع) دەڵێ : ((دایك و باوك نابێ منداڵیان بەرەڵلاّی كۆلاّن بكەن ، لێی نەپرسێتەوە ئایا كێ دەكات بەهاوڕێی خۆی لەبەرئەوەی منداڵ كەم ئەزموونە لەوانەیە تووشی منداڵی خراپ بێ))٠
(ش) دەڵێ : ((ڕۆژانەی منداڵ پێویستی سەرشانی دایك و باوكە ، چونكە ئەو منداڵە پێو یستی بەپارەهەیە ، كەدەچێتە قوتابخانە بۆئەوەی چاوی لەدەستی هاوڕێكانی نەبێت لەبە رئەوەی منداڵ كەدەچێتە قوتابخانە شت دەبینێ وەك : خواردن ئەگەر ڕۆژانەی نەدرێتێ لەوانەیەلەهاوڕێكانی بخوازێت وەك : كێك و شەربەت و زۆرشتی دیكە ، ڕۆژانەش بۆتەعا دەت و خوێك ، هەروەها منداڵ بوون ونەبوونی نازانێ ، بەلاّم نابێت فێری ڕۆژانەی زۆری بكەی ، چونكە ئەگەرڕۆژێ لەڕۆژان ئەودایك و باوكە باری ئابوورییان باش نەبوو لێیان كە م بكرێتەوە كاریگەری باش نابێت))٠
(ع) دەڵێ : ((كەم كردنەوەی ئەركەكانی مارەبڕین و گواستنەوە و ئاهەنگێڕان وشت ومەكی كەمالیات دەبێتەهۆیەك بۆئەوەی ئافرەت بتوانێت ماڵی سەربەخۆ بۆخۆی دابین بكات))٠
(م) دەڵێ : ((ژنهێنان پڕۆسەیەكی پیرۆزەچەندین مەبەستی كۆمەلاّیەتی و دەروونی لەخۆ وە دەگرێت ، یەك لەبنەماسەرەكییەكانی ژنهێنان بەردەوامییە نابێت ئەو پڕۆسەیە بەكا-

**تێکی دیاریکراوببەسترێتەوە وەتامردن بەیەکەوە بژین وەژنهێنان تەنها بۆچارەسەرکردنی گیروگرفتی جنسی نییە))۰**

**(ل) دەڵێ : ((لەپرۆسەی خوازبینی دا ڕابردووی کچ زۆرگرینگە ، کاتێك کوڕان خوازبینی کچان دەکەن پێی خۆشە بزانێ ڕابردووی ئەوکچە چۆنە ، بۆیە لەڕابردووی ئەوکچە دەکۆ لێتەوە))۰**

**(ن) دەڵێ : ((لەسەرئێمەی دایك وباوکان پێویستە منداڵەکانیان ڕابهێنن لەسەرخوێندنەوە۰ مانگانە گۆڤارێکی مندالأنیان بۆبکڕین ، خۆشەویستی خوێندنەوە لەناودڵیان بڕوێنین))۰**

**(س) دەڵێ : ((حەزدەکەم کوڕێك ببێتەهاوسەرم تەمەنی لەخۆم گەورەتربێ وبالأی لەخۆم درێژتربێ وخاوەن کەسایەتی بێت))۰**

**(ت) دەڵێ : ((ئەوکەسەی دەبێتەهاوسەرم کاروکاسبی هەبێت وڕەوشتی بەرزبێت))۰**

**(پ) دەڵێ : ((ئەوکەسەی دەبێتە هاوسەرم لەگەڵم بگونجێ))۰**

## ئافرەت و شووکردنەوە :

شووکردنەوە بەهۆکاری ونبوون ، زانایانی ئیسلام لەژنی مێردمردوو بیروڕای جیاوازیان هە یە ، کەئایائارام دەگرێت تا ئەوکاتەی چارەنووسی مێردەکەی بەدەردەکەوێت یاخود ماوەیە کی دیاریکراو چاوەڕوان دەکات تاچارەنووسی مێردەکەی بەدیاردەکەوێت پاش ئەوماوەیە شوودەکاتەوە ؟

لەدادگا پاش بەسەرچوونی ماوەیەك دادوەربڕیاری جیابوونەوەیان دەدات لەسەرداوای ژنە کە بۆئەوەی دووربێت لەزیان٠

ئەگەرمێردەکە ونبووبێت وهەوالّی نەبێت و شوێنی نەزانراوبێت وەك گەشتیارێك دەچێت بۆ بازرگانی یاخود بۆخوێندن ، دووەمیان ئەوەیە بزربوونەکەی لەڕوودا لەناوچوون بێت وەك ئەوکەسەی لەدەریادا کەشتییەکە دەشکێت و هەندێك لەسەرنشینەکانی لەناودەچن ، ئەوەلێرەدا بەپێی بۆچوونی ئاڕاستەی حەنبەلی ژنەکە چوارسالّ چاوەڕێ دەکات و دواترما وەبەندی مێردە مردوو دەگرێت ، کەچوارمانگ و دەڕۆژە دواتردەتوانێت هاوسەرگیری بکا تەوە، بەلاّم شافعییەکان دەلّێن نابێت ژن هاوسەرگیری بکاتەوە تادلّنیادەبێت لەمردنی مێر دەکەی ، بەلاّم حەنبەلییەکان دەلّێن ئەگەرچارەنووسی مێردەکەی نادیاربوو ئەوابڕیاردەدر ێت بەمردنی پاش بەسەرچوونی ماوەیەك ، کەداوەر دیاری دەکات٠ئەگەربڕیاردرا بەمردنی ئەواژنەکە ماوەبەندی مێردمردوو دەگرێت دواتردەتوانێت هاوسەرگیری بکات٠هەروەهائیما ئیمامی مالك وادەڕوانێت کەکەسی ونبوو کەبزرە ئەواپاش چوارسالّ بەمردوو دادەنرێت٠

(م) دەلّێ : ((دووسالّ بەرلەوەی ئەسیربکرێم ژیانی هاوسەریم پێکهێنا پاشان بانگکراین بۆ سەربازی لەسالّی (١٩٨٣)من ئەوکاتە یەك مندالّم هەبوو کوڕێك بەناوی (ك) ، هەمان سالّ وا تا لەسالّی (١٩٨٣)چوین بۆ(فاو) پاش (١٥)پانزە ڕۆژلەوێ لەهەلّمەتێکی هێزەکانی ئێراندا من لەگەلّ سێ هاوڕێی دیکەم بەناچاری خۆمان دابەدەستەوە٠بەرلەوەی لەمالّەوەبڕۆم بۆسەربا زی کوڕەکەم زۆرگریابەشوێنمدا خۆشم خەوم بینی کەلەجێگەیەك ونبووم نەمدەزانی لەکو یم ؟ کەنیشانەی ئەسیری من بوو٠من بەدرێژایی ئەو(١٠) دەسالّە گەلێك ناخۆشیم بینی هە moomوومان بەتایبەتی ئەوانەی خێزانیان هەبوو دەگریان بۆ هاوسەرومندالّەکانیان هەروەها بۆ دایك و باوك و خوشك وبرا ، چونکە نەهەوالّمان پێدەگەیشت نەدەمانتوانی نامەبنێرین بۆ

یە زۆرێك لەوكەسانەی كەلەوێ بوون تووشی نەخۆشی دەروونی بووبوون یان دەمردن٠وە ختێ ناوم خوێندرایەوە من یەكەم وەجبەبووم كەدیل بەدیلمان پێكرا ، كەپێیان وتم خۆ ت ئامادەبكە بەیانی ئازاددەكرێیت زۆردڵخۆش بووم ، چونكە (١٠)دەساڵ بوو ژن ومنداڵە كەم نەدیبوو بەردەوام بیریانم دەكرد زۆرخەمی ئەوەم بوو بمرم بۆیەكجاری نەیان بینمە وە٠وەختێ هاتینەوە بەغدا كەس وكارەكەم دووشەوودووڕۆژبوو لەوێ چاوەڕوانیان دەكرد م، ئاهەنگیان بۆسازكردبووم لەماڵەوە بۆیەكەمجاردایكم بینی كەهات بۆلام دووجارلەهۆش خۆی چوو ، پاشان براكانم ، خوشكەكانم ، منداڵەكەم ، بەلاّم هاوسەرەكەم لەگەڵیان نەبوو وەختێ پرسیارم كرد گوتم : كوان ئەوان ؟ وتیان : لەماڵەوەن میوان زۆرە٠من دەستم لە — ملی كوڕەكەم دابوو دەگریام لەخۆشیاندا ، بەلاّم لەكەركووك بۆنانخواردن دابەزین كوڕەكە م پێی وتم : باوكە شووی كردۆتەوە ئەوە ناخۆشترین ساتی ژیانم بوو تەنیا وتم : كوڕەكەم خۆم ماوم تابمێنم نازت هەڵدەگرم بۆیەلەوساتەوە تائێستا بڕیارم داوە بێ هاوسەربژیم))٠

(ك) دەڵێ : ((ساڵی (١٩٨٥) بانگكراین بۆسەربازی من لەسنوری بەسرا دەستگیركرام لەپەلا مارێكی هێزەكانی ئێراندا٠هاوسەرەكەم بەرلەوەی ببێتە هاوسەرم خۆشەویستم بوو دوای هاوسەرگیری (٣)سێ منداڵم لێی بوو بەردەوام لەزیندان بیری ئەوانم دەكرد بەتایبەتی هاو سەرەكەم ئەگەرچی ئێمە لەناو زیندان دا ترسی ئەوەمان هەبوو هاوسەرەكانمان شووبكەنە وە ، بەلاّم من هەرگیزبیرم لەوەنەدەكردەوە هاوسەرەكەم شووبكاتەوە وبەجێم بهێلێ ، چو نكە من وئەوبەخۆشەویستی بەیەكگەیشتبووین تاڕاددەیەكیش خزم بووین ، كاتێك لەبەها ری ساڵی (١٩٩٤) ئازادكراین هێنایانینەوە بۆ بەغدا لەوێ باوكم هات بۆلام پاشان گەڕاینەوە بۆسلێمانی ئاهەنگێكی گەورەم بۆسازكرابوو ، برایەكیشم كۆچی دوایی كردبوو٠دەربارەی ها وسەرەكەم پرسیارم دەكرد كەس وەلاّمی نەدەدامەوە بۆیەڕووم كردە خوشكەكەم وتم : كوا هاوسەرەكەم ؟ ئەوباوەشی پیاكردم و وتی : شووی كردۆتەوە٠ئیدی ئەوەناخۆشترین ساتی ژ یانم بوو زۆرجاردەیبینم ، بەلاّم چاوەكانم پڕدەبێت لەگریان وبەجێی دەهێڵم و یەك وشەم بۆناوترێ))٠

**ئافرەت وحیجاب :**

**وشەی حیجاب لەقورئاندا ناوێك نییە بۆجلك ، بەمانای پەردە هاتووە ، پەردەش ڕێگرە لە بەردەم بینین٠مەلای گەورەی كۆیە دەڵێ : ((بەشەرلە البشرة هاتووە یانی پێست ، مەبە — ست ئەوەیە پێستی بەدەرەوەیە وەك ئاژەڵ و پەلەوەر لەشی بەموو دانەپۆشراوە پێویستی بەوەیە جل لەبەربكات))٠**

**حسام الدین جودت لەكتێبەكەی دا ((كۆسپەكانی حیجاب)) دەڵێ : هەندێ كەس دەڵێن چە ند ئافرەتێك هەن حیجاب دەپۆشن كەچی كاری بەدڕەوشتی دەكەن لەژێرئەم بەرگە خۆیان حەشارداوە بۆیە ئێمە حیجاب ناكەین ، ڕاستە لەوانەیە هەندێ ئافرەتی واهەبن ، بەڵام نا بێتە پاساو ، چونكە ئەوكەسەی بەرگی سەربازی دەكاتەبەر بۆ بەرگری كردن لەنیشتیمانە كەی ئەگەرهاتووسەربازێك ناپاكی كرد ئەمە ئەوەناگەیەنێ كەبەرگەكەخراپ بێ ئیترنابێ كەس بەرگی سەربازی بكاتەبەر٠**

**(ت)دەڵێ: ((من ماوەیەك پانتۆڵم لەبەردەكرد ، بەڵام دواترگەیشتمە ئەوقەناعەتەی كەئافر ەت بەوجۆرەجوانە ، كەلەڕەگەزی بەرامبەری جیابكرێتەوە ، چونكەئافرەت بەجلی ڕاستە قینەی خۆی جوانتروناسكترە))٠**

**(ئیمیلیایلۆمەر) كچەڕۆژنامەنووسێكی ئەمریكی بوو یەكەم ئافرەت بوو پانتۆڵ لەبەربكات ، ئەمەش ڕێگای لەبەردەم كچانی دیكەش خۆش كرد ئەم جلەلەبەربكەن٠**

**لەخراپییەكانی سەرخۆشی :**

**عارەق عەقل و ژیری مرۆڤ تێكدەدات ناكۆكی ودوژمنایەتی دەخاتە نێوان خەڵكی و لەكر داری شەیتانەوپیسە٠كلیلی هەمووگوناه وتاوانێكە خەڵكی لەیادی خوا ولەنوێژكردن دوور دەخاتەوە وتووشی ئابڕوچوونی دەكات و بخۆرەكەی وەك شێت لێدەكات و ناسناوی عارەق خۆری پێوەدەلكێنی وپیاوكوژی بەلاوە ئاسان دەكات ونهێنی ئاشكراكردنی بەلاوە ئاسان دە كات٠مەیخواردنەوە چەندشەڕی ناوەتەوە ، چەندەها دوژمنایەتی بەرپاكردووە ، چەندەها پەیوەندی ژن و پیاوی تێكداوە٠ درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((هەركەسێ لەدنیادا مەی بخواتەوە ، ئەوە لەبەهەشت نای خواتەوە ))٠خوای گەورە لەسوڕەتی (محمد) لەبارەی ڕوبارەكانی بەهەشت دەفەرموێ : {وأنهرمن خمر} واتا : (چەند ڕوبارێك لەشەڕاب) بەلاْم ئەو شەڕابەی لەبەهەشت هەیە وەك شەڕابی دنیانییە، چونكە عارەقی دنیا عەقل و ژیری تێكدەدات و دوژمنایەتی دەخاتە نێوان خەڵكی ، بەلاْم شەڕابی بەهەشت تەنیا بۆلەزەت و خۆشی دەیخۆنەوە٠**

## هەواڵی ڕووح :

مردن دەرچوونی ڕوحە لەجەستە ، چارەنووسێکە هەموومرۆڤێك پێی دەگات٠ئاینی اسلا م ، کەدوایین ئاینی ئاسمانییە مردنی واڕوونکردۆتەوە کەدەرچوونی ڕۆحە لەجەستە٠

پزیشکێکی بەناوبانگی وەك (کریستیان بەرنارد) ، کەبەڕێوەبەری پزیشکانی چاندن و گوا ستنەوەی دڵە بۆلەشی مرۆڤ ، یەکەم کەسیشە کەتوانیویەتی دڵ لەمرۆڤێکی مردوو بۆمرۆ ڤێکی زیندوو بگوازێتەوە ، ئەم پزیشکە لەچاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی سالآنی هەشتاکان لە ئیتاڵیا ڕایگەیاندووە کە بڕوای بە (گیان)هەیە٠مرۆڤ بەمێشکی خۆی ناتوانێ بزانێ کە گیان چییە ؟ چونکە ئەمەلەسەرووی زانیارییەکانی تێگەیشتنی مرۆڤە٠دەڵێ : من چەند جارێك گیانی مرۆڤم بینییوە لەکاتێکدا بەتەواوی بیروهۆشم لای خۆم بووە ، لەبەرنامەیەکی تەلە فزیۆنی بەناوی (مسترۆ) دەڵێ : یەکێ لەنەخۆشەکانم تووشی نەخۆشی جگەربووبوو منیش لەژوورێکی تایبەت دانیشتبووم نزیکەی کاتژمێر(١٠)دەی شەوبوو ، دەرگای ژوورەکەکرایەوە ئافرەتێکی گەنجی لاوازی لەش زەرد لەمن نزیك بۆوە دەستی خستەسەرسینگم و بەهەموو هێزی خۆی پاڵی بەسینگمەوەنا وهیچ قسەیەکی نەکرد منیش دەستم گرت هەستم کردزۆر نەرمە جیاوازبوولەگەڵ گرتنی دەستی مرۆڤ وکەمێك دوورم خستەوە لەخۆم و تێبینی ئەو ەم کرد کێشی هەرنەبوو ئەویش دوورکەوتەوە کاتێك ڕۆیی دیقەتم دایێ کەقاچەکانی لەسە رزەوی نەبوون ، بەڵکولەهەوادابوون بەپەنجەرەکەدا ڕۆیی و لەبەرچاوم ونبوو٠لەوکاتەدا زە نگی ژوورەکەم ژەنی کچەبرینپێچەکەی بەردەستم هاتەلام داوای لێبوردنی کردو وتی : بە داخەوە هۆی دواکەوتنم ئەوەبوو ، کەخەریکی نەخۆشێك بووم گیانی دەدا لێم پرسی باشە وەسفی ئەونەخۆشەم بۆبکە ، چۆن بوو ؟ وتی : گەنجبوو ، درێژبوو ، زۆرلەڕولاوازبوو ، دوو چاوی شینی هەبوو سەیردەکەم هەمان نەخۆش بوو کەگیانی هات بۆلام، بەلاّم نازانم لەبەر چی هات بۆلای من ؟! چەندڕووداوێکی دیکە خۆم بینیومە بڕوای تەواوم بە ژیانی دوای مر دن هەیە٠

نموونەیەکی تر : کابرایەك لەسالآنی شەستەکان ژنێکی ئیمانداری هەبوو بەناوی (ه) کوڕ- ێکی هەبوو بەناوی (ئیبراهیم) دەڵێ : نزیکەی دوومانگ بوو ئەوخێزانەم داوای لێدەکردم بیبەم بۆبەغدا بۆچارەسەری نەخۆشییەکەی منیش بردمە بەغداو لەنەخۆشخانەی گشتی

خەواندیان و وتی : من و تۆبەیەکەوە ناگەڕێینەوە گوتی : توخوالەجیاتی من ئیبراهیم ما چ بکە ، دەڵێ : منیش چوومە میوانخانە و شەو لەسەرجێگا ڕاکشابووم ، سەیرم کردخێزا نەکەم بەلەشێکی سپی زۆرجوان هات بۆلام و باوەشی بۆمن کردەوە ، منیش وتم : ئافرەت ئەوەچی دەکەی لێرە ؟ لەبەرچاوم ونبوو هەرچەندە بانگم کرد بێسوود بوو٠بەیانی هە — ڵسام چوومە نەخۆشخانە کەگەیشتمە ئەوێ پۆلیسێکی عەرەب کەلەبەردەرگای نەخۆشخانە بوو ، پێی وتم : خێزانەکەت کاتژمێر (١١)ی شەومرد٠دیارە گیانی هاوسەرەکەم بووە هاتبوو خواحافیزیم لێبکات٠

تێبینی :

ئەم بابەتە وەرگیراوە لەگۆڤاری هەرێم ، ژمارە (٢٩٦) ی ساڵی (٢٠٠٣) ، کە فیکرەت عیزەت نوسویەتی ، من ناونیشانەکەم گۆڕیوە٠

**سەیروسەمەرەکانی دڵ :**

**پیشەی سەرەکی دڵ بریتییەلەناردنی خوێن بۆهەمووبەشەکانی لەش ، کەکاردەکات وەکوتر ومپایەك بۆگواستنەوەی خوێن بۆئەندامەکانی لەش بەبێ وەستان و وچاندان٠**

**لەساڵی (١٩٩١) "درووارمور" ڕای گەیاند کەلەناودڵ دا مێشك (عقل) ێکی بچووك هەیە بیردە کاتەوەوهەست دەکات دواتریش زانیارییەکان دەنێرێت بۆمێشك ، پێشتریش قورئانی پیرۆز ئەوڕاستییەی سەلماندووە٠**

**لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەك نەشتەرگەری چاندنی دڵ پەرەی سەندووە ، نوژدا ران تێبینی دیاردەیەکی سەیریان کردووە ئەویش گۆڕانی باری دەروونی ئەونەخۆشەی کار ی چاندنی دڵی بۆدەکرێت بەڕاددەیەك گۆڕان لەبیروباوەڕی و ئەوەی حەزی پێدەکات وئەوە ی حەزی پێناکات٠**

**کاتێك ئەومرۆڤەی دەمرێت بەهۆی ڕووداوێك دڵی یەکسەرنامرێت ، بەڵکوبۆماوەیەکی دیار یکراودەمینێتەوە٠ئەگەردکتۆرەکان پێڕاگەیشتن دڵی دەربێنن و بیخەنە ناوشلەیەکی تایبە تی وسەرپەرشتی بکەن ئەوابۆماوەیەکیش دەمینێتەوەوسوودی لێ دەبینرێت بۆنەخۆشێکی دی کەپێویستی بەگۆڕینی دڵ هەیە٠**

**کچێکی هەشت ساڵی دڵێکی بۆچیندرا دڵەکەش لەکچێکی کوژراوی تەمەن دە ساڵەبوو ، لەدو ای کرداری چاندنەکە کچەکە تووشی خەونی ناخۆشی تۆقێنەردەهات ، کەلەخەودا دەیبینی بکوژێك کچێك دەکوژێت تاسەردانی دکتۆری دەروونییان کرد ئەو وێنانەی لەخەونەکان دە یبینی زۆرڕوون وئاشکرابوون بەجۆرێك هەواڵی وێنەی بکوژەکەیان گەیاندە پۆلیس ، بەهۆ ی سیفاتەکانی پۆلیس بکوژی کچەکوژراوەکەیان دەستگیرکرد٠**

**دکتۆر (چوارتز) ڕای گەیاندووە کەهەڵساین بەچاندنی دڵ بۆمنداڵێك لە منداڵێکی تر کە دایکی دکتۆربوو ، لەدوای مردنی منداڵەکە دایکەکە بڕیاری دا دڵی کوڕەکەی ببەخشێت، ئە م دایکەدەڵێ : هەمیشەهەست دەکەم کوڕەکەم لەژیان داماوە، کاتێك لەم منداڵەنزیك دەبمە وەئەوەی هەڵگری دڵی منداڵەکەمە کاتێك دەیکەمەباوەش واهەست دەکەم منداڵی خۆمە٠**

**سەمەرەیەکی ترکوڕێکی تەمەن هەژدە ساڵە شاعیرومۆزیك ژەن بوولەڕووداوێکی ئۆتۆمبێل دا گیانی لەدەستدا٠دوای مردنی دڵی دەگوازنەوە بۆ کچێکی هەژدە ساڵی دوای چاوپێکەوتن**

لەگەڵ دایك و باوکی کچەکە : کچەکە پارچەمۆزیك دەژەنێ و ئەوگۆرانیانە دەڵێ کەپێشتر کوڕەکەدەیووت بەبێ ئەوەی پێشترگوێی لێ بووبێت٠

سەمەرەیەکی تر (سون غراهام) کەکەسێکی خێرخوازبوو ، بەلاًم پاش چاندنی دڵی کەسێك کەخۆی کوشتبوو گۆڕانکاری زۆری بەسەرداهات بەهەمان شێوەخۆی کوشت٠

سەمەرەیەکی تر کەسێکی تربەناوی (کلێر) کەتەمەنی چل وحەوت ساڵ بوو تووشی پاڵەپەستۆی سییەکان بوو نزیك بوولەمردن وەرێکەوتی کوڕێك بووکەمردبوو بەهۆی ماتۆڕسکیلە وە دڵیان چاندبۆ (کلێر) ، پاشان یەکسەر ئەم خاتوونە (کلێر)گۆڕانکاری بەسەرداهات کەدڵی بۆ (بیرە) دەچوو کەپێشترنەی خواردبووەوە ، هەروەها دڵی بۆکچان دەچوو !

**ڕاڤەی (٣٠) فەرموودەی پێخەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) :**

**یەکەم : ((من حسن اسلام المرء ترکه مالایعنیه))٠**

**وەك ئەوەی ئەم ئۆتۆمبێلەتان چۆن کڕی ؟! ، ئەرێ کچەکانت بۆ شووناکەن ؟ ئەرێ داخوا زییان نییە ؟**

**(ز) دەڵێ : ((مەسەلەی تەداخولکردنی ژیانی خەڵکی زیاترلەوگەڕەك و شوێنانە دروست دەبێت ، کەزۆرتێکەڵی یەکترین))٠**

**(ع) دەڵێ : ((هەندێ جار تۆدەتەوێت پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەسێك ببەستی بۆئەوەی زۆرترین خەڵك بناسی بۆیە هەندێ وردە قسەدەکات وەك : ئەمڕۆڕۆژێکی خۆشە یان ڕۆژێکی گەرمە٠بۆیە هەندێ جارداوای خۆناساندن دەکەیت بەعەشیرەت یان باوك و باپیر یان ئەوشوێنەی لێی دەژی هەندێك جاریش پرسیاری کاروپیشەدەکرێت ئەمەش دەرگای پەیوەندی لەگەڵ دەورووبەردەکاتەوە ، بەلاَم ئەگەر هاتوو هەندێ پرسیاری ناشەرعیمان کرد ئەوە لەوانەیە ببێتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتیمان))٠**

**دووەم :** ((المرض حطة)) رواه أحمد وحاكم٠

**واتا : ((نەخۆشی مایەی سڕینەوەی تاوانەکانە))٠**

**هەروەها درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((پەتاوکۆست وبەلأو دڕك و پچڕانی پەتی نەعلەکەی ، تەنانەت کەشتێکی لەبەرچاو وون دەبێ و بۆی دەکەوێتە پەژارەو بۆی دەردە کەوێ کەوتۆتە ژێردەستی یەوە بەوانە مرۆڤی باوەڕدار لەتاوانەکانی پاك دەبێتەوە))٠**

سێیەم : ((ان مما أدرك الناس من كلام النبوة الاولى : اذا لم تستح فاصنع ما شئت)) أخرجه البخاري وأبوداود٠

**واتا : ((ئەوەی لەقسەی پێخەمبەرانی پێشوو تا ئێستا ماوەتەوە لەشەریعەت و بەرنامەی پێخەمبەرە یەکەمەکان شەرم کردنە ئەوسیفەتەش بەبەردەوامی مایتەوەونەچوویتە ئەو شتانەی ڕەشکراوەتەوە لەشەریعەتی پێخەمبەران ، ئەگەرشەرمت نەکرد چیت ئارەزوولێیە ئەنجامی بدە))٠ئەم وتەیەش :** (فاصنع ماشئت) **مەبەست پێی ترساندنە٠**

**ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لەئوبەی کوڕی کەعبەوە ، دەڵێت : پێخەمبەری خوا ( درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((خودا (جل جلاله) ئادەمی دروست کرد ، پیاوێکی بالأبەرزبوو قژی سەری زۆربوو ، وەك دارخورمایەکی بەرزوابوو ، کاتێ کەتامی درەختەکە ی کرد جل وبەرگەکەی لەبەری کەوتەخوارەوە کاتێ کەسەیری شەرمی خۆی کرد بەتوندی خۆی دەخستە ناوبەهەشتەوە ، درەختێ قژی گرت وپێیەوە گیرایەوە ، لەوکاتەدا خودا(جل جلاله) بانگی کرد : ئەی ئادەم لەمن ڕادەکەی ؟ کاتێ کەگوێی لەقسەی خودا بوو ، وتی : نە خێر ئەی پەروەردگارم ، بەلأم شەرم دەکەم٠**

**وەهەبی کوڕی مونەبیە وتوویەتی : پۆشاکی ئادەم و حەوا ڕوناکییەك (نور) بوو بەسەرعە یبیانەوە ، ئادەم عەیبی حەوای نەدەبینی ، حەواش عەیبی ئادەمی نەدەبینی کاتێ لەودارە یان خوارد عەیب وعاریان کەوتەدەر٠**

**خودای گەورە دەفەرموویێت :** {يبنى ءادم قدأنزلنا عليكم لباسا يورى سوءتكم وريشا و لباس التقوى ذلك خير}

**واتا : (ئەی نەوەکانی ئادەم ئێمە جل وبەرگی وامان دانێ کەعەیب وعارتان دابپۆشێ وجو انیشتان دەکات ، چاکترلەویش پۆشاکی خۆپاراستنە)٠**

**خودای گەورە فەرمووی :** {ولاتقربا هذه الشجرة} **واتا : (نزیکی ئەم دارە مەکەون)٠ئەمە تاقیکردنەوەی خودا بوو بۆئادەم وحەوا ، هەندێ دەڵێن ئەم درەختە گەنمە ، بەلأم گەنم درەخت (**شجرة**) نییە ، هەندێ دەڵێن (ترێ)یە ، بەلأم (ترێ)ش مێوە ، هەندێ دەڵێن هە نجیرە ، زانینی هیچ سوودی نییەونەزانینیشی هیچ زیانی نییە٠**

**حاکم ڕیوایەتی کردووە لەئیبن عەباسەوە ، دەڵێت : لەبەهەشت نەمانەوە لەنوێژی عەسرە وە تاخۆرئاوابوون نەبێ واتا : لەنوێژی عەسرتاخۆرئاوابوون مانەوە٠**

ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لەئیبنوعەباسەوە ، دەڵێت : ئادەم دابەزێنرایە خوارەوە بۆسەرزەمینێك پێی دەوترا (دەحنا) لەنێوان مەککەوتائیف دا٠وتراویشە ئادەم (سەلامی خو ای لێ بێ) لەهیند دابەزێنرا ، حەواش لەجەدە٠

ئافرەتی ئەمڕۆ ئەوجل وبەرگەی لەبەری دەکات ، ئەوەی لێرە هەیە وەکوئەوەیە لەئەستە مبوڵ هەیە ، بەهەمان شێوەی ئافرەتانی ئەوروپین ، گەورەترین گرینگی پێدانی ڕۆژانەی ئافرەتان بابەتی جوانکارییە٠

الجرجانی دەڵێت : ((الحیاء شەرم کردن واتا وازهێنانی شتێکە لەترسی گازاندەوگلەیی))٠

وەك شەرم کردن لەبەدیارکەوتنی عەورەت ، یان دوکاندار جل وپۆشاکی ناوەوەی ئافرەتی لەبەردەم فرۆشگاکەی هەڵواسیووە بێ ئەوەی شەرم لەو ئیشە نابەجێیەی بکات ، چونکە ئەمە نەزەری پیاوڕادەکێشێت٠ ناوەندی توێژینەوەی خێزانی لەشاری (دۆیسلدۆرف)ی ئە ڵمانی ڕایگەیاندووە : ئافرەتان باڵیان بەسەر بیرکردنەوەی ٩٥٪ی پیاوان دا کێشاوە بەجۆر ێك لەهەرخولەکێکدا بۆ (٦) چرکە ئافرەتان بەسەربیرکردنەوەی پیاوان زاڵ دەبن٠

(چ) دەڵێ : ((شەرمکردن لەقسەکردن من ئەوەبەهەڵە دەزانم، بەلآم دەبێت مرۆڤ شەرم بکا ت دزی بکات ، ٠٠٠تاد))٠

(ع) دەڵێ : ((شەرمکردن لەپرسیارکردن بەهەڵەدەزانم ، چونکە درودی خوای لەسەربێ فەر موویەتی : لایتعلم العلم مستحي ولامستکبر))٠

**چوارەم :** ((لن يدخل أحد منكم الجنة بعمله)) أخرجه البخاري ومسلم٠

**واتا : ((هیچ کەس لەئێوە بەکردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە))٠ئیبن قەییم باسی کرد ووە ، دەڵێ : بەڕاستی چوونە بەهەشت تەنها بەبەزەیی خوایە نەك بەکردەوەی خۆی ، بە لاّم کردەوەکانیش هۆکارن بۆئەوە٠**

**پێنجەم :** ((اية المنافق ثلاث : اذاحدث كذب واذا وعد أخلف واذا أوتمن خان)) متفق عليه٠

**واتا : ((نیشانەی دووڕوو سیانە : ئەگەرقسەی كرد درۆدەكات وە ئەگەر بەڵێنی دا نایباتە سەر وە ئەگەرئەمانەتێكی لادانرا خیانەتی لێ دەكات))٠**

**نیفاق بریتییە لەوەی بەزمان ئیسلام دەربخات و لەناخی دا كافری بشارێتەوە ئەوە نیفاقی اعتیقادی یە ، بەلاَم نیفاقی كرداری دەبێتە هۆی ئەوەی ئیمانەكەی كەم بكاتەوە ، بەلاَم لە ئیسلام دەری ناكات٠ئەونیفاقەی لەم دەقەدا هاتووە لەجۆری نیفاقی بچووكە وەك درۆكردن و بەڵێن جێ بەجێ نەكردن و خیانەت لەئەمانەت٠هەروەك سوێند خواردن بەغەیری خوا وەك ئەم فەرموودەیە :** ((من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك))٠

**واتا : ((هەركەسێك سوێند بەغەیری خوا بخوات ئەوەكوفری كردووە یاخود شیركی بڕیاردا وە))٠**

**شەشەم :** ((من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فاءن لم يستطيع فبلسانه ، فاءن لم يستطيع فبقلبه ، وذلك أضعف الأيمان))

**١ – گۆڕینی خراپە بەدەست :**

**لێرەداپێویستە وریای ئەوەبین ، کەزۆرجارناکرێ تاکەکانی کۆمەڵگە هێزبەکاربێنن ، چونکە دەبێتەهۆی ئاژاوە ، بەڵکوئەرکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنە (پۆلیس و سوپا و ئاسایش) بۆئەوەی ئەوخراپەیە بگۆڕن٠**

**٢ – گۆڕینی خراپە بەزمان :**

**ئەمەدەبێت تاکەکانی کۆمەڵگە بەکاری بێنن ، هەروەها دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پیاوانی ئا ینی٠ئەگەرئەوکەسە زانیت ئامۆژگاری بکەی توڕەدەبێت وجنێودەدات قسەنەکەی باشترە٠ وەبنەمای دروست لەمامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی هەڵە بەشێوەیەك ئەوکەسە لەڕێزی کەم نەبێتەوە وشەی جوان بەکاربێنین٠**

**٣ – بەدڵ پێت ناخۆش بێت٠**

**حەوتەم :** ((الناس شركاء في ثلاث : في الأكل ، والماء ، والنار)) رواه أحمد وأبوداو د٠ **واتا : ((خەڵك لەسێ شت هاوبەشن : لەخۆراك و لەئاوو لەسووتەمەنی))٠**

**سەیدقوتب لەكتێبەكەی دا : ((كۆمەڵگەی ئیسلامی)) دەڵێ : ((سیستەمی ئیسلام ماوەی هە ندێ مولكداریەتی گشتی دەدات ئەم پێكچوونە مانای وانییە سیستەمی ئیسلام سیستەمێكی سۆشیالیستی یە ، بەڵكوئەمە پێكچوونێكی ڕواڵەتی یە٠هەروەها ئاینی ئیسلام ماوەی مولكد اریەتی تایبەتی دەدات ئەم پێكچوونە مانای وانییە سیستەمی ئیسلام سیستەمێكی سەرمایە دارییە))٠**

**هەشتەم :** ((٠٠٠كل المسلم على المسلم حرام دمه وماله وعرضه))

**واتا : ((٠٠٠هەمووموسوڵمانێك خوێن ومالٚ وناموسی حەرامە لەسەرموسوڵمان))**

**خوای گەورەداوێنپیسی قەدەغەکردووە لەبەندەکانی و ئەوهۆکارانەشی قەدەغەکردووە ، کە دەبنە هۆی ڕوودانی ، دەفەرموێت :** {ولاتقربوا الزنى انه كان فحشة وساء سبيلا} الاء سراء : ٣٢

**واتا : (توخنی داوێنپیسی مەکەون ، چونکە داوێنپیسی ئاکارێکی زۆرنالەبارەوڕێگایەکی خر اپە)٠**

**ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لەئەبوئومامەوە ، کەلاوێك هاتە لای پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وتی : ئەی پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) ڕێگام بدە زینابکەم ، خەڵکەکە ڕوویان تێکردوسەرزەنشتیان کرد ، وتیان : بێدەنگ بە ، بێدەنگ بە٠پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : نزیکی کەنەوە ، باش لێیان نزیك کردەوە ، جافەرموو ی : دانیشە٠دانیشت ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : ئایابۆدایکت پێت خۆ شە ؟وتی : نەبەخوا ، خوابمکاتە قوربانت ، فەرمووی : خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆدایکیان٠ فەرمووی : ئایاپێت خۆشە بۆکچەکەت ؟ وتی : نەبەخوا ئەی پێخەمبەری خوا (درودی خوا ی لەسەربێ)خوابمکاتە قوربانت ، فەرمووی : خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆکچەکانیان٠فەرمو وی : پێت خۆشە بۆخوشکت ؟ وتی : نەبەخوا ئەی پێخەمبەری خوا ( درودی خوای لەسەر بێ ) خوابمکاتە قوربانت ، فەرمووی : خەڵکیش بۆخوشکەکانیان پێیان ناخۆشە٠فەرمووی : ئایاپێت خۆشە بۆپورت (خوشکی باوکت یان دایکت)وتی : نەبەخوا ئەی پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) خوابمکاتە قوربانت ، فەرمووی : خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ پور یان٠پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) دەستی لەسەرداناوفەرمووی : ئەی خودایە لەگوناهی ببورەودڵی پاك کەرەوەوشەرمگەی بپارێزە٠گەنجەکە ڕۆیی وئەوشتەی لەمێشکی چووە دەرێ٠**

**وتوویانەبۆزیانی خۆشەویستی ئەوەندە بەسە ، کەچەندان کەس بەهۆیەوە تێداچوون ئەوە ش لەهەمووسەردەمێکدا٠**

(أبو عباس الناسىء) **لەدێرەشیعرێکدا دەڵێ :**

اذا المرء يحمي نفسه حل شهوةلصحة أيام تبيد وتنفد

فمایاله لایحتمي من حرامها لصحة مایبقی له ویخلد

**واتا : ئەگەرمرۆڤ لەبەرخاتری لەشساغی چەندرۆژێك خۆی لەشەهوەتی حەلال دەپارێزێ**

**ئەی بۆخۆی لەحەرامەکەی ناپارێزێ لەپێناوی ژیانێکی هەمیشەیی و نەبڕاوە ؟**

(ابن قیم الجوزیة) له (روضة المحبین) **دەڵێ : ((گەورەترین دەبەنگی ئەوەیە بەهەشتی نەبڕاوە بفرۆشی بەچێژێکی کاتی کەخۆشییەکەی دەڕوات ونەگبەتییەکەی دەمینێتەوە))٠**

**ڕابواردن لەگەڵ کچان یەکێکەلەکارەناشیرینەکان وناڕەواکانی مرۆڤ ، کەلەگەڵ ڕەگەزی بەرا مبەردەیکەن بۆتێرکردنی حەزوغەریزەجنسییەکانی خۆیان ، ئایاکوڕان ڕازی دەبن ئەوکارە لەگەڵ خوشکی خۆیان بکرێت ؟**

**(س) دەڵێ : ((من زۆرڕابواردن دەکەم٠هەرکاتێ ماڵەوەمان بەسەفەردەڕۆن و ماڵ چۆڵ دە بێت کچەکەپڵەکان دەبەمەوە ، بەڵام قبول ناکەم خوشکم وابکات ئەگەربزانم کوڕێك ڕابو اردن لەگەڵ خوشکم دەکات ئەوادەیان کوژم))٠**

**لێرەداپرسیارێك لە(س)دەکەین شەڕەفی خۆت دەپارێزی کەچی شەڕەفی خەڵکی ناپارێزی ؟**

**(ل) دەڵێ : ((چوارساڵ کوڕێکم خۆش دەویست هەمووجارێ لەجێی ژوان ماچی دەکردم — ئێستاش کەپێی دەڵێم وەرەخوازبینیم دەڵێ دەچمەهەندەران))٠**

**(ش) دەڵێ : ((دووساڵەکوڕێکم خۆش دەوێت زۆرپیاسەوگەڕانی بەنهێنی ماڵەوە لەگەڵ کرد ووم چەندجارێك ماچی کردووم ئێستاش هەردەڵێم وەرەخوازبینیم کەچی بیانوودەدۆزێتە وە دەڵێ : پارەم نییە ، پەلەت چییە؟**

**(ف) دەڵێ : ((سێ ساڵە پەیوەندی خۆشەویستیم لەگەڵ کوڕێك هەیە چەندجارێکیش ما — چی کردووم ، لەباوەشی گرتووم ، ئێستاش پێی دەڵێم وەرەخوازبینیم دەڵێ من وتۆلەگەڵ یەك ناگونجێین ، چونکەمن دڵ پیسم و تۆش ئازادی تەواوت هەیە))٠**

**(ن) کچێکە دەڵێ : ((دوای ئەوەی پەیوەندی خۆشەویستیم لەگەڵ کوڕێکدابەست وای لێهات لەپەیوەندی خۆشەویستییەوە بووە پەیوەندی جنسی بەتایبەتی لەبەرئەوەی خانووەکەمان نێوان سەربانی ئێمەوئەوان دیوارێکی بچووك بوو ئیدی بەهۆی ئەوهاتنانەی ئەو وەکوژن و مێردمان لێهاتبوو من پێم وتووە لەماوەی مانگێکدا بێتەداوام وبم خوازێ ، بەڵام ئەوتاوەکو ئێستاوەڵامێکی تەواوی منی نەداوەتەوە))٠**

**نۆیەم :** ((کل واشرب والبس وتصدق في غیرسرف ولامخیلة))رواه أبوداود وأحمد٠

**واتا : ((بخۆوبخۆرەوە و بپۆشە و خێربکە بەبێ زیادەڕەوی و فیزکردن))٠**

**دەیەم :** ((اذاأتاکم من ترضون خلقه ودینه فأنکحوه ، ان لاتفعلوه تکن فتنة في الأرض وفسادکبیر)) رواه الترمذي وابن ماجة والحاکم والبیهقي وغیرهم٠

**هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان زۆرگرینگە بەتایبەتی کەدووسیفەتی گرینگی تێدابێت ، بێگو مان ئەگەرئەم دووسیفەتەی تێدانەبێت ، کچ بەختێکی باشی نابێت ، بەڵام زۆرشتی تریش هەیە دەبێ بیزانین ، لەوانە :**

**لەوانەیە ئەوکوڕەی دێتەداوای کچەکەت کوڕێکی باش وڕێك وپێك بێ ، بەڵام لەوانەیە دەو روپشتی : خوشك و دایك و ئەمانەی کاریگەرییان بەسەری هەبێت نەهێڵن ئەوکچەئاسوود ەبێت بۆیە لەسەرت پێویستە لەسەرخانەوادەی کوڕەکە زانیاریت هەبێ ، لەسەردایکی ، خو شکەکانی بزانی چۆنن ؟ توندن ؟ شەڕاوین ؟ ئەمانە هەمووی گرینگن وپێویستە بیانزانی٠ ئەگەرباوکەکەی پیاوکوژبێت ؟ کچیش ئەگەرڕێك وپێك بێ ، بەڵام دایکی خەریکی ئەم جۆ رەکارانەبێت ؟**

**دەیەم :** ((المرأة كالضلع ، ان أقمتها كسرتها ، وان استمتعت بها استمتعت بها وفيها عوج))

**واتا : ((ئافرەت وەك پەراسووە ، ئەگەربتەوێ ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی ، ئەگەریش لەگە ڵی دابژی بەوخوارییەی پەراسوو دەمینێتەوە))٠**

**پیاوێك دێتەلای پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) شکاتی حالی ژنەکەی لادەکات ، کەبیانو وی پێدەگرێ ، پێخەمبەریش(درودی خوای لەسەربێ)سروشتی ئافرەتی بۆباس دەکات٠بۆیە پیاودەبێ لەهەندێ وردەکێشە بەئارام بێ ، چونکەوەك پەراسووی لاربووبێتەوە ئەگەربتەو ێ ڕاستی کەیتەوە دەشکێ ، شکانیش تەلاقە٠**

**يازده :** ((اذااستعطرت المرأة ثم مرت بقوم يوجد ريحها أنها زانية)) رواه أبوداود و الترمذي٠

**واتا : ((هەرئافرەتێك گولأولەخۆی بدات و بەلای كەسانێكدا بڕوات و بۆنەكەی بكەن ، ئە وازینای كردووە))٠لێرەدامەبەست ئەوزینایەنییە حەددی لەسەرە٠**

**سەبارەت بەبەكارهێنانی بۆن لەلایەن ئافرەت ئەوقەدەغەكردنەی لەوفەرموودەیەدا هاتووە بۆدەرەوەی ماڵە٠**

**دوازده :** ((ان الله تسعة وتسعين اسما من أحصاها دخل الجنة))٠

**واتا : ((خوای گەورە نەوەدونۆناوی هەیە، هەرکەسێك بیانژمێرێت دەچێتە بەهەشتەوە))٠**

**مەبەست ئەوەیە کاریان پێبکات ، ئیبنوبەتتال دەڵێ : ڕێگاکانی کارپێکردن ئەمانەن : -**

**یەکەم : ئەوناوانەی دەکرێ پەیڕەوییان لێ بکرێ وەکو (الرحیم) یانی میهرەبانی ، الکریم واتا بەڕێز٠**

**دووەم : ئەوناوانەی تایبەتن بەخودای گەورە وەکو (المتکبر) بەندە لەخۆی نەهێنێتەدی٠**

**سێیەم : ئەوناوانەی واتای هەڕەشە و تۆڵە و سزای تێدایە بەندە لەئاستیان بترسێ٠**

**سێزده :** ((ان أشدة الناس عذابا عندالله يوم القيامة المصورون)) رواه البخاري٠

**واتا : ((رۆژی دوایی ئەوەی لەهەمووان سزاکەی توندتربێت وێنەکێشەکانن))٠هەروەها فه رموویەتی :** ((لاتدخل الملائكة فيه كلب ولاتصاوير)) رواه البخاري٠

**واتا : ((فریشتەکان ناچنەماڵێك سەگ و وێنەی تێدابێت))٠**

**وێنەکێشانی گیانلەبەر و مرۆڤ وداتاشینی لەسەربەرد یان لەکاغەز تاوانێکی گەورەیەوده چێتەچوارچێوەی ئەوفەرموودانە ، کەهەڕەشەیان لەوێنەکێشان کردووە ، بەڵام ئایاجیاوا زی هەیەلەنێوان وێنەکێشان و وێنەگرتن ؟**

**سەربازمحەممەدحەسەن لەنامیلکەکەی دا : ((وێنەگرتن لەنێوان ڕێپێدان و قەدەغەکردن دا)) ، بەم شێوەیە بۆمان دەدوێ : ((چەندفەرموودەیەك هەیە باسی حەرامی وێنەکێشان دەکەن ، بەڵام وێنەگرتن و وێنەکردن دووشتی لێك جوودان ، جیاوازییەکی زۆرگەورەهە یەلەنێوان وێنەگرتن و وێنەکێشان٠**

**خوای گەورەدەفەرمووێ :** {هوالله الخالق البارئ المصور له الأسماء الحسنى ٠٠٠}

**الحشر : ٢٤ خوای گەورە یەکێك لەناوەکانی (المصور)ە واتا : (وێنەکێش)٠**

**خوای گەورەدەفەرمووێ :** {هوالذي يصوركم في الأرحام كيف يشاء} ال عمران : ٦

**هیچ کەس لەتەفسیری ئەوئایەتەدا ناڵێ : خوای گەورە وێنەمان دەگرێ لەڕەحمی دایکدا ، بەڵکودەڵێ : خوای گەورە وێنەمان دەکێشێ لەڕەحمی دایکدا ، لەبەرئەوە وێنەگرتن لە گەڵ وێنەکێشان دووشتی لێك جودان٠کەسێك کەدەچێتە ستۆدیۆ دەڵێ : وێنەیەکم بگرە ناڵێ : وێنەیەکم بکێشە ، واتا خۆت خاوەنی ئەو وێنەیەی خۆتی کەخوای گەورە پێی بە خشیووی ، کابرای وێنەگرتەنها وێنەکەت دەگرێ بۆیە زۆرگرینگە بزانین وێنەکردن وو ێنەگرتن دووشتی لێك جودان٠**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((اذامربالنطفة اثنتان وأربعون ليلة ، بعث الله اليها ملكا ، فصورها وخلق سمعها وبصرها ولحمها وعظامها٠٠٠)) ر واه مسلم٠

**واتا : کەچل ودووڕۆژتێپەڕی بەسەرئاوی پیاولەڕەحمی ئافرەت دا ئەوکاتە خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێ وێنەی دەکێشێ و بیستن و بینین و پێست وگۆشت و ئێسقانی بۆ**

دروست دەکات٠

جالێرەدا درودی خوای لەسەربێ نافەرمووێ وێنەی دەگرێ، بەڵکوماناکەی وێنەی دەکێشێ بۆیەکاتێ بەکامیراوێنەدەگرین ئێمەتەنها ئەووێنەیە دەگرین ودەیگوازینەوە سەرکاغەز کە خوای گەورەپێی بەخشیوین ، لەبەرئەوە ئیشی کامیرا وێنەکێشان نییە بەڵکووێنەکەدەگوا زێتەوەسەرکاغەز، هەروەکوئەوەی ئێمەکاتێك لەئاوێنەسەیری خۆمان دەکەین ووێنەی خۆ مان دەبینین ئایائاوێنەکەوێنەی کێشاوین یان تەنیاوێنەی خۆمانەونیشانمان دەدا ؟ گرتنی وێنەوگواستنەوەی بۆسەرکاغەزهیچ جیاوازی نییە لەگەڵ ئەوکەسەی کەلەئاوێنە سەیری خۆی دەکات و وێنەی خۆی دەبینێ٠ئەگەرهاتووتاوانێك لەشوێنێك ئەنجام دراو تاوانبارده ستگیرنەکرا خەڵکێك تاوانبارەکەیان بینی ئەوادەکرێت بەپێی وەصفی ئەوخەڵکە وێنەی تاوانبارەکە بکێشرێ بۆدۆزینەوەی ئەوکارەش ناچێتەچوارچێوەی هەڕەشەی فەرموودەکان هەروەهاوێنەکێشان بەمەبەستی فێرکردنی زانستی یان بۆدروستکردنی فیلم کارتۆنی مند الێ ناچێتەئەوچوارچێوەیەوە))٠

**چوارده :** ((ان العبد ليصلى الصلاة لايكتب له سدسها ولاعشرها وانما يكتب للعبد من صلاته ماعقل منهما)) رواه أبوداود والنسائي وابن حبان٠

**واتا : ((جارى وايه بەندە نوێژدەكات شەشيەكى بۆنانوسرێت و دەيەكى بۆنانوسرێت ، ئەوە ندەى بۆدەنوسرێت لەنوێژەكەى فكرى لەلاى بێت))٠**

**پازده :** ((فمن أحب شيئا أكثرذكره)) رواه أبونعيم والدليمی عن عائيشة٠

**ماناى : ((ئەوەى شتێكى خۆش بوێت زۆريادى دەكات))٠**

**شازده :** ((ثلاثة لاتجاوز صلاتهم رءوسهم : العبد الابق ، وامرأة زوجها ساخط عليها وامام أم قوما وهم له كارهون)) رواه الترمذي٠

**واتا : ((سىٚ كەس نویٚژیان لەسەرسەریان تیٚناپەڕیٚت : عەبدی هەڵهاتوو ، ژنیٚك میٚردەكەی لیٚی تورەونیگەران بیٚت ، ئیمامیٚك (ئەوەی پیٚشنویٚژی دەكات) پیٚشەوایەتی كۆمەڵیٚك بكات ئەوان ڕقیان لیٚی بیٚت))٠**

**حەڤدە :** ((اتخذ مؤذنا لايأخذ على الأذان أجرا)) رواه النسائي وأبوداود وغيرهما٠

**ماناى : ((بانگدەرێ بگرە لەسەربانگدان کرێ وەرنەگرێت))٠هەندێ لەزانایان ڕێیان بەوەر گرتنی کرێی بانگدان داوە٠**

**هەژدە** : ((اذاحضرالعشاء وأقيمت الصلاة فأبدوا بالعشاء)) رواه البخاری ومسلم عن ابن عمروعائشة.

**مانای : ((نانی ئێوارە پێش نوێژی عیشابخورێت ئەگەرخواردن ئامادەبوو وکاتی نوێژبوو)) تادڵ سەرقاڵ نەبێت.**

**نۆزده :** ((اذاصلى أحدكم بالناس فليخفف فاءن فيهم الضعيف والكبير وذالحاجة واذا صلى لنفسه فليطول ماشاء)) رواه البخاري عن أبي هريرة٠

**ماناى : ((ئەگەریەکێکتان پێشنوێژی کرد باکورتی بکات ، چونکە لاوازوبەتەمەنیان تێدایە هەروەهاخاوەن پێداویستی تێدایە ، بەلاّم ئەگەربۆخۆی نوێژی کرد ئەواباچەندئارەزووی لێ یە درێژی بکاتەوە))٠**

**مەعازی کوڕی جەبەل (خوالێی ڕازی بێ) پێشنوێژی عیشای بۆخەڵك کرد سوڕەتی بەقەرە ی تێداخوێند پیاوێك لەنوێژەکەی دەرچوو بۆخۆی تەواوی کرد ، وتیان : ئەوپیاوە دووڕوو دەرچوو٠شکات چووە بەردەستی پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەربارەی ئەمە ، ئەو یش سەرزەنشتی مەعازی کردوپێی فەرموو : ئایاتۆفیتنە هەڵگێرسێنی ئەی مەعاز ؟ سوڕە تی :** سبح ، والسماء والطارق ، والشمس وضحاها **بخوێنە٠**

**بیست :** ((من ترك الجمعة ثلاثا من غير عذر طبع الله على قلبه))رواه أحمد والنسائي٠

**ماناى : ((ئەوەى وازلەسێ جومعە بهێنێت بێ بوونی عوزروبیانوو ئەواخودا مۆردەنێت بە دڵی دا))**

**ئیمامی غەزالی دەڵێت : ((چەندشتێك عوزری نەچوون بۆجومعەی تێدایە ، لەوانە : باران بارینی مەترسیدار ، چەقین لەناوقوڕدا ، ترس ، نەخۆشی ، نەخۆش تیمارکەر ئەگەرنەخۆ شەکەکەسی دەست نەکەوت جگەلەو))٠**

**بیست و یەك :** (( من غسل يوم الجمعة واغتسل ثم بكر وابتكر ومشى ولم يركب ودنا من الامام وانصت ولم يلغ كان بكل خطوة يخطوها من بيته الى المسجد عمل سنة – صيامها وقيامها)) رواه أحمد٠

**واتا : ((ئەوەی خۆی بشوات و زووبچێت بۆمزگەوت و بۆخوتبەلەوێ بێت ، بەپێ بڕوات نە ك سواری ، نزیك بێتەوە لەئیمام و بێدەنگ بێت قسان نەكات بەهەرهەنگاوێك لەماڵ بۆمز گەوت خێری كرداری ساڵێك یان پاداشتی ساڵێك ڕۆژوو وهەستان بۆبەندایەتی بۆدەنوسرێت ))٠ئیمامی شافیعی وتوویەتی : ((ئەوەی پۆشاكی خاوێن بكاتەوە مەراقی كەم دەبنەوە ، بۆ- نی خۆش بێت عەقلی زیاد دەكات))٠**

**بیست و دوو :** ((لاطلاق في اغلاق))

**ماناى : ((لەكاتى توڕەيى دا تەلاق ناكەوێ)) ئەبوداود ڕیوایەتی كردووە.**

**خوای گەورە دەفەرمووێ :** {ولويعجل الله للناس الشر استعجالهم بالخير لقضي اليهم أجلهم} يونس : ١١

**لەبارەی تەفسیری ئەم ئایەتە وتوویانە ئەمە پیاوێكەلەكاتی توڕەیی دادوعا لەخۆی ومالٚ و منداڵی دەكات ئەگەربێت خوای گەورە دوعاكەی گیرابكات ئەوا خۆی و مالٚ منداڵی لەناودە بات ، بەلاٚم خوای گەورە چونكە دەزانێ ئەم پیاوە سەرخۆشی توڕەیی وای لێكردووە ئەم د وعایە بكات بۆیە دوعاكەی گیراناكات.**

**بیست و سێ : ((٠٠٠الدين النصيحة))٠**

**ماناى : ((٠٠٠ئاين ئامۆژگارييه))٠**

**صەباح هەركى لەكتێبەكەى دا : ((ئاين ئامۆژگارييه)) دەڵێ : ((وشەى ئامۆژگارى ماناى زۆر هەڵدەگرێت وەك : دڵسۆزى نواندن ، ڕوونى ، ٠٠٠هتد))٠ئيبن حەجەرى عەسقەلانى دەڵێ : نارێكى براكەى بەئامۆژگارى ڕێكدەخاتەوە وەك چۆن دەرزى و داو نارێكى جل و بەرگ ڕ-ێكدەخاتەوە بۆيەدەڵێن تەوبەى نەصوح ، چونكە وەك ئەوەوايە كەگوناهەكان ئاينى ئەوكە سە پارچەپارچەبكەن و لەبەريەك هەڵيبوەشێننەوە ، تەوبەش بيگەيەنێتەوە يەك و ڕێكى بخاتەوە٠هەروەهاصەباح هەركى لەكتێبەكەى دا وا پێناسەى ئامۆژگارى دەكات ، كەبريتييە لەڕاستكردنەوەى هەڵەى كەسێك بەشێوازێك كەهيچ توندوتيژى و بەسەردا سەپاندن و زۆر لێكردنى لەگەڵدانەبێت٠هەروەهادەڵێ : ئامۆژگارى هەرئەوەنييە وتەيەك بەبەرامبەرەكەت ڕابگەيەنى ، بەڵكودەبێ بزانى ئەم وتەيەجێگەى خۆى بگرێت ، چونكە ئەگەربەشێوازێكى جوان نەبێت لەوانەيەكەسى بەرامبەرئامۆژگارييەكەوەرناگرێت بۆئەوەى كاريگەربێت دەبێ كەسى ئامۆژگاريكارڕەچاوى كات و شوێن و بارى كۆمەڵايەتى وئاستى ڕۆشنبيرى وجۆرى بير كردنەوەى كەسەكان بكات ، ئەوكەسە نەشكێنێتەوە لەناوخەڵكى شەرمەزارنەبێت ، بەتەنها بێت٠هەروەهاپێويستەكەسى ئامۆژگاريكارئەوئامۆژگارييانەى كەدەيكات لەخۆى دا بينێتەدى بێگومان هەركەسێكيش ئامۆژگارى بكات لەخۆى دانەبێت هەرزيانى بۆخودى كەسەكە نييە بەڵكوزيانى بۆ زانيارييەكەش هەيە٠ئەم وتەيە : (بەقسەم بكە ، بەڵام بەكردەوەم مەكە) ئە گەرشتێك لەخۆت دا نەبێت لێت وەرناگرێت٠ئەبوحەنيفە بەمنداڵێك دەڵێ : ئاگات لەخۆت بێ ئەى منداڵ نەكەوييە ناوئەم قۆرتە ، منداڵەكەبە(ئەبوحەنيفە) دەڵێ : تۆئاگات لەخۆت بێ نەكەوى ئەى ئيمام ، چونكە ئەگەرتۆبكەوى تەنها خۆت ناكەوى خەڵكيش لەگەڵ تۆدە-كەوى٠پێغەمبەر(درودى خواى لەسەربێ) دەفەرموێ :** ((ان أخوف ماأخاف على أمتي : **حكم جائر ، وزله عالم ، وهوى متبع))** رواه الطبراني٠

**واتا : (( ئەوەى زۆرلێى دەترسم دووچارى ئوممەتەكەم بێت بريتييەلە : دەسەڵاتدارێكى ستەمكار و هەڵەوهەڵخليسكانى زاناو شوێنكەوتنى هەواوئارەزوو))٠**

**بیست و چوار : جابر(خوالێی ڕازیبێ) دەڵێ :** ((لعن رسول الله(صلى الله عليه وسلم) – أكل الربا وموكله وكاتبه وشاهده))٠

**ماناى : ((پێخەمبەر(درودى خواى لەسەربێ) نەفرەتى كردووە لەڕیباخۆروخاوەن ڕیباكەو نوسەروشاهیدەكان))٠**

**ڕیبابۆنموونە دینارێك بدەى بەقەرزبەدینارونیوێك ، یاخود شتێك بفرۆشى بەحازرى بەنرخێك ، بەقست لەونرخەزیاتر٠**

بیست و پێنج : ((لوكانت الدنيا تعدل عندالله جناح بعوضة ماسقى كافرا منها شربة ما ء))

**واتا : ((ئەگەردنیا نرخی باڵە مێشوولەیەکی لای خوای گەورەهەبوایە ، ئەوانەیدەهێشت کا فرقومێك ئاوی تێدابخواتەوە))٠کەواتە لەبەربێ نرخییە دنیادراوەبەکافر ، لەبەرئەوەی کا فرهیچ کردەوەیەکی چاکی بۆنانوسرێت وپاداشتیان نییە لەقیامەتدا لەبەرئەوەزۆرجارلەوا نەیەکەمترلەئێمە ناخۆشییان تووش دێت ، هەندێ جارلەخۆشیش دادەژین ، خوای گەورە دەفەرمووێت :** {ولولاأن يكون الناس أمة واحدة لجعلنا لمن يكفربالرحمن لبيوتهم سقفا من فضة ومعارج عليها يظهرون ولبيوتهم أبوابا ٠٠٠الى اخرالاية} الزخرف : ٣٣

**واتا : (ئەگەرلەبەرئەوەنەبوایە کەخەمووخەڵکی ببن بەکافرورەحمی خوابەموسوڵمانان نە بوایە ئەوائەوکەسانەی کەکوفربەخوای گەورەدەکەن وامان دەکرد کەبنمیچ وپەیژەی خانو وەکانیان کەپێی دادەچنەنهۆمەکانی تر لەزیوبوایە ، دەرگای خانووەکانیان و ئەوچارپایەی کەلەسەری دەحەسێنەوە بەهەمان شێوەلەزیوبوایە٠٠٠)٠**

**بیست وشەش :** ((الظلم ثلاثة ؛ فظلم لايتركه الله ، وظلم يغفر ، وظلم لايغفر فأماالظلم الذي لايغفرفالشرك لايغفره الله وأماالظلم الذي يغفرفظلم العبد فيمابينه وبين ربه فأما الظلم الذي لايترك فظلم العباد فيقتص الله لبعضهم من بعض))

**واتا : ((ستەم سێ جۆره : ستەم هەیە پەروەردگاروازی لێ ناهێنێت وستەمێك هەیە لێی خۆ ش دەبێت ستەمێك هەیە لێی خۆش نابێت ئەویش هاوبەش پەیداکردنە ، ئەوی لێی خۆش دەبێت ستەمی بەندەیە لەنێوان خۆی و خودادا ، وەئەوستەمەش کەوازی لێ ناهێنێت سته می بەندەکانەلەنێوان خۆیان دا))٠**

**بیست وحەوت :** ((ان أخوف ماأخاف عليكم الشرك الأصغر ، قالوا ومالشرك الأصغر ؟ قال : الرياء)) رواه أحمد٠

**مانای : ((بەڕاستی ترسناكترین ئەومەترسییانەی ، كەلەسەرئێوەی شیركی بچووكە ، هاوەڵاّ ن وتیان : شیركی بچووك چییە ؟ فەرمووی : ڕیا))٠**

**ڕیاواتا پێش چاوی خەڵك ، واتا لەخواپەرستی دا تەنهاخودامەبەستی نەبی پێش چاوی خە ڵك بۆئەوەی ڕێزی لێبگرن لەپێش چاوی خەڵكی نوێژەكەی زیاتربڕازێنێتەوەكاتێك یەكێك سەیری دەكات تاكوبەعەبدێكی چاك دەربكەوێ وڕێزی لێ بگیرێ ، باسكردنی چاكەی خۆت لەڕۆژنامە و فەیسبووك دەچێتەقالبی ڕیا٠**

**بیست وهەشت :** ((مامن عبد يقوم في الدنيا مقام سمعه ورياء ، الاسمع الله به على رؤو
س الناس الخلائق يوم القيامة)) رواه الطبراني٠

**واتا : ((هەرکەسێ ڕیایی لەکردەوەکانی دا بکات باسیان بکات لای خەلکی بۆئەوەی پلەی بەر
زبێتەوە لای خەلکی و ڕێزی لێ بگرن و بەپیاوێکی باشی دابنێن ، ئەوە لەڕۆژی دوایی خوا
ی گەورە لەپێش چاوی خەلکی سوك و ڕیسوای دەکات و خەلکیش هەوالی سوککردنەکەی د
ەبیستن بەویستی خوا))٠**

**بیست ونۆ : ((انما العلم بالتعلم))**

**واتا : ((زانست بەخۆفێرکردنە))٠**

**واتا بەهەوڵدان و خوێندن و خوێندنەوەیە بۆیەهەرکەسێك بانگەشەی ئەوەبکە بڵێ ئەوزا نست و زانیارییەی هەمە هەمووی بەرهەمی مێشکی خۆمە ، ئەوادرۆی کردووە ، چونکە — تەنها پێخەمبەران (علیهم السلام) خوای گەورە خۆی زانست و زانیاری پێداون ، وەحیکمە ت لەکردنی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەنەخوێندەوار تا نەڵێن لەڕێی ڤیرائەت و خوێندنەوەبووە٠**

**سى :** ((٠٠٠فيدخل رجل منهم على ثنتين وسبعين زوجة مما ينشىء الله ، وثنتين من ولدادم ٠٠٠))٠

**ماناى : ((دەچێتەلاى حەفتاودووحۆرى کەخوادروستى کردوون ، هەروەها دوانيش لەنەوەى ئادەم))٠**

**لەبارەی ڕەزیلی و دەستبلاوی :**

**خوای گەورە دەفەرموویت :** {قل لو أنتم تملكون خزائن رحمة ربى اذا لأمسكتم خشية الاءنفاق وكان الاءنسن قتورا} الاءسراء : ١٠٠

**واتا : (بلێ : ئەگەرئێوە خاوەنی گەنجینەکانی بەزەیی پەروەردگاری من بوونایە ، هەرڕژ دیتان دەکرد ، مرۆڤ ڕژدوچاوچنۆکە)٠ئیبنوعەباس دەلێ :** {خشية الاءنفاق} **واتا : لەتر سی هەژاری٠لەترسی ئەوەی نەوەك بڕوات ولەدەستتان بچێت ، لەگەڵ ئەوەی کەهەرگیزتە واونابێت ودوایی نایەت٠**

**ڕەزیلی دەست پێوەگرتنە لەوکاتەدا کەپێویستت پێ بێ٠بەلاّم دەستبلاّوی خەرجکردنە لە وکاتەدا کەپێویستت پێی نەبێت یان زیاد لەبڕی پێویست بەمەش خەرجی زیاد دەکات٠**

**(ع) دەلێ : ((ئەوئیسرافەی کەبەهۆی مونافەسەی کەسانی ترەوە ، کەبەدوای گۆڕینی ماڵ و خانوو سەیارەوە بێ ، سەیارەکەی بگۆڕێ بەسەیارەیەکی ترو سەیارەکەی دەفرۆشێتەوە بە (٢٠) وەرەقە زەرەر مۆدیلێکی بەرزتردەکڕێ ، کەوەنتەری ناومەتبەغ بە (١٥) وەرەقە دەکڕێ بە (٣) وەرەقە دەیفرۆشێتەوە کەوەنتەرێکی تردەکڕێتەوە هەموو ساڵێك کەوەنتەر ومالّی دەگۆڕێ کەهۆیەکەبۆ نەمانی پارە))٠**

**(ئە) دەلێ : ((ڕەزیلی هەرلەگرتنەوەی ماڵ ودارایی نییە زانیارییەکی بەسوود دەزانی دەری نابڕی ئەمەش دەچێتە قالبی ڕەزیلی))٠**

**(ع) دەلێ : بۆنموونە من دەمەوێت کۆمپیوتەرەکەم بگۆڕم بەمۆدیلێکی بەرزتر هەرچەندە کارەکانیشم بەوەی ئێستاجێ بەجێ دەبێت ئەمەش دەستبلاّوییە))٠**

**(گ)دەلێ : ((هاوڕێیەکم هەیە کاتێ بەهۆی ئیش وکارەوە تەلەفۆنم بۆدەکات دەلێ : کارتی تێدانەما بۆم بکەرەوەبەڕاستی پێی دلّتەنگ دەبم هەرجارێك تەلەفۆن دەکات لەنیوەی قسە کانی دای دەخات نوکەنوك دەکاتەوە کەخۆم بۆی بکەمەوە بۆیەڕەزیلی ئەوهاوڕێیەم بۆدەر کەوت من ئەودیاردەیەدەخەمە قالبی ڕەزیلی))٠**

**ئیبن عەبباس وتوویەتی : (( کەسێك سەد هەزاردیناربەحەق لەشوێنی خۆی خەرج بکات ئیسراف نییە ، بەلاّم یەك درهەم بەناهەق ئیسرافە))٠**

**مەلای گەورەی کۆیە دەلێ : ((ژن وماڵ ، نەك ماڵ و ژن ، زۆرمان دیت فەقیربوون ژنی چا کیان بەنسیب بوو بەکەسابەت و ئیقتیصاد دەوڵەمەندبوون))٠**

**پرسەوسەرەخۆشیکردن :**

**مردووی خەڵکی بەخەڵکی خەولێکەتییە (پەندی پێشینان)٠واتا : هیچ کەس وەك کەس و کاری مردووەکە خەمبارنین٠بەڵام مرۆڤ نابێ وابێ بەڵکودەبێ هەستی مرۆڤایەتی هەبێ٠ محەممەدعەبدولرەحمان لەتیف لەکتێبەکەی دا :((وتەی زانایانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی سەبارەت بەکات و شوێن و شێوازی سەرەخۆشیکردن و پرسەو تەعزییە گێڕان)) دەڵێ : (( لەمەزهەبی شافیعی دا پرسەوسەرەخۆشیکردن تەنها بریتییە لەسێ ڕۆژ ، بەڵام زۆربەی زا نایان بۆئەوەچوون ، کەکات و ماوەی دیاریکراوی نییە بەڵکوتاوەکو لەبیری دەکات و شوێنە وارەکانی نامینێت لەدڵ ودەروونی دا))٠**

**مەبەست لەسەرەخۆشیکردن هێورکردنەوەی دڵی ئەوکەسەیە کەمردووەکەی لێ مردووە بۆ ئەوەی سەبوورییان بداتەوە و ئارام بگرن ، وە تەعزییە لەزماندا بریتییە لەدڵدانەوەودڵنە واییکردن٠وەپرسەوسەرەخۆشیکردن بەنووسین یان بەنامە یان بەتەلەفۆن دەبێت٠گومانی تێدانییە کەکەس وکاری مردوو ئارامی وسەبورییان دێت غەم وپەژارەیان کەم دەبێتەوە بە هۆی ئەوەی کەدەیبینن لەبەدەمەوە هاتن و هاوکاریکردنی موسوڵمانان بۆیان لەشۆردنی مر دوو و قەبربۆهەڵکەندن و ناشتنی مردووەکەیاندا٠پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەر موویەتی :** ((مامن مؤمن يعزي أخاه بمصيبة الاكساه الله سبحانه وتعالى من حلل الكرا مة يوم القيامة)) رواه ابن ماجة٠

**واتا : ((هیچ ئیمانداریك نییە بەهۆی موسیبەتێکەوە دڵنەوایی وسەرەخۆشی بکات لەبرایە کی ئیمانداری ئیللاخوای تەعالاپۆشاکی ڕێزلێنانی لەبەردەکات لەڕۆژی قیامەتدا))٠**

**لەموسنەدی ئیمام ئەحمەد دا هاتووە ، دەڵێ : ڕوقیەی کچی پێخەمبەر (درودی خوای لەسە ربێ) وەفاتی کرد ، ئافرەتان گریان ، ئیمامی عومەریش (خوالێی ڕازی بێ) بەقامچی لێیانی دا ، پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی :** ((دعهن ياعمر يبكين واياكن ونعيق الشيطان ، ثم قال : انه مهما كان من العين ومن القلب فمن الله ومن الرحمة وماكان من اليد ومن اللسان فمن الشيطان)) رواه أحمد٠

**واتا : ((لێیان گەڕێ بگرین ئەی عومەر ، ئێوەش ئەی ئافرەتان وریابن قیژەوهاواری مەکەن ، پاشان فەرمووی : تاوەکو بەفرمێسکی چاوو خەفەتباری دڵ بێ ئەوە لەلایەن خواوەیە ورە**

**حمەتە ، کەبووە لەخۆدان و قیژەوهاوارکردن ئەوەلەلایەن شەیتانەوەیە))٠چونکە گریان بر یتییە لەهەستی مرۆڤایەتی بەرامبەرخەڵك٠**

**هەروەها لەموسنەدی ئیمام ئەحمەد دا هاتووە لەعائیشەوە کەکاتێ سەعدی کوڕی موعاز مر د پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) و ئیمامی ئەبوبەکر و عومەرلای ئامادەبوون ، دەڵێ : سوێند بەخوا من لەودیومالی خۆمدا بووم گوێم لەگریانی ئەبوبەکروعومەربوو٠**

**سەبارەت بەوەی پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((ان المیت لیعذ ب بالنیاحة علیه))٠

**واتا : ((مردوو بەقیژەوشیوەن بۆکردن سزادەدرێت))٠**

**دایکمان عائیشە (خوالێی ڕازی بێ) وتوویەتی : ئیوە هەڵەتێگەیشتوون ، پێخەمبەری خوا ( درودی خوای لەسەربێ) بەلای گۆڕی جولەکەیەکدا تێپەڕی و فەرمووی :** ((ان صاحب هذا القبر یعذب وأهله یبکون علیه))٠

**واتا : ((خاوەن ئەم گۆڕە سزادەدرێت و کەس وکاریشی بۆی دەگرین))٠ هەروەها دایکمان عا ئیشە (خوالێی ڕازی بێ) بەڵگەی هێناوەتەوە بەم ئایەتە :** {ولاتزر وازرة وزر أخری)) الأنعام : ١٦٤

**واتا : (هیچ کەس گوناهی کەسێکی ترهەڵناگرێ)٠**

**پیاوێك بۆکوڕەکەی دەگری ، یەکێکی تریش پێی دەڵێ : ئەی مامی خۆم تازەبەگریانەکانت ناگەڕێتەوە ، پیاوەکەش دەڵێ : دەزانم منیش هەربۆئەوە دەگریم٠**

**بەڕاستی گریان نیشانەی سۆزوبەزەیی و پاککەرەوەیە بۆناخی مرۆڤەکان ئارامکردنەوەی دڵ ودەروونە ، هەرکەسێك گریان ڕەت بکاتەوە ئەوە تەنها ڕوخساری مرۆڤی پێوەیە٠"جۆزیف ڕوکسن" دەڵێ : ((جۆرەکەسانێك هەن پێدەکەنن بۆئەوەی جوانی ددانەکانیان بەدەرکەوێت ، کەسانێکیش هەن دەگرین بۆئەوەی دڵەنەرمەکانی خۆیانی پێ دەربخەن))٠پێخەمبەر (در ودی خوای لەسەربێ) لەکاتێکدا بۆئیبراهیمی کوڕی دەگریا فەرمووی:((ئەمەسۆزوبەزەییە)) تۆلەپەیامبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەدین تری ؟**

**ئەبی سەعیدی خودری دەگێڕێتەوە ، کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((لقنوا موتاکم لااله الاالله))** رواه الطبراني٠

**واتا : ((تەلقینی مردووەکانتان بکەن بەڕستەی لاالەالاالله))٠**

هەندێ لەزانیان دەڵێن : ئەم تەلقینە بۆکاتی گیان لەدەستدانە ، هەیانەلەزانایانیش دەڵێ بۆپاش مردنە٠

سەردارفەقێ حەسەن لەکتێبەکەیدا : ((سێ گوناھ وتاوان لەپەنای ئیسلامدا)) لەبارەی تە لقینەوە دەڵێ : ((تەلقینی مردووانیان داهێناوە ، دوای ئەوەی کەسێکی موسوڵمان دەمرێ لەنێوگۆڕەکەی دەشێردرێتەوە شك و گومان دەباتەسەری بەناوی دایکی بانگی دەکات وەك کوڕی باوکی خۆی نەبێ تەنهادایکی دەزانێ ئەومنداڵە لەچ پیاوێکە وگومانی بیژی بۆدرو ست دەکات و بەبەرچاوی سەدان لەئامادەبووان شك و گومانی بیژی بۆدروست دەکات چۆن خودای گەورەیان پێخەمبەرەکەی ڕێگەمان پێدەدات ئەوسوکایەتییە بۆخۆمان دروست بکە ین))٠

سەردانیکردنی گۆڕستان هۆکارێکە بۆلابردنی دڵڕەقی وبیرکردنەوە لەحالی ئەوکەسانەی لە گۆڕدان٠لەئەنەس ، پێخەمبەردرودی خوای لەسەربێ دەفەرموێت : ((كنت قدنهيتكم عن ز يارة القبور ، ثم بدالي أنه ترق القلب ، وتدمع العين ، وتذكرة الاخرة ، فزوروها ولا تقولوا هجرا)) رواه أحمد وابن أبي الدنيا٠

واتا : ((من پێشترڕێگریم لێکردن سەردانی گۆڕستان بکەن ، بەلاَم ئێستا بۆم دەرکەوتووە د ڵ نەرم دەکات و فرمێسك بەسەرچاوان دەهێنێتە خوارێ و ئاخیرەتتان بیردەخاتەوە ، شین وشیوەن بۆمردوو نەکەن))٠

کەواتەچوون بۆسەرگۆڕستان سوننەتە لەبەرئەوفەرموودەیەی باسمان کرد، لەکاتێکدا موسو ڵمانان لەسەرەتای ئیسلامدا بوون ،درودی خوای لەسەربێ ڕێگری لێکردن بچن بۆ گۆڕستان بەلاَم دوای ئەوەی حالی بوون لەئیسلام درودی خوای لەسەربێ فەرمووی : بچن ، چونکە دو اڕۆژتان بیردەخاتەوە٠

چوون بۆسەرگۆڕستان لەڕۆژی دیاریکراودا باشترە لەبەرشوبهەی خراپ٠

سوننەتە ئەوکەسانەی ئامادەی سەرگۆڕستان دەبن هەریەکەیان سێ خاکەناس خۆڵ هەڵداتە سەرقەبرەکە ، چونکە ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردووە ، کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) نوێژی لەسەرجەنازەیەك کردوپاشان چووە سەرگۆڕەکەی و سێ خاکەنازخۆڵی کردە سەرگۆ ڕەکەی لەلای سەریەوە٠

ئەوعادەتەی خەڵك فێری بوون دەچن لقی درەختێك لەسەرگۆڕی مردووەکانیان دادەنێن لا

ی هەندێك لەزانیان دانانی سوننەتە لەبەرئەوفەرموودەیەی کەئیمامی بوخاری هێناویەتیە
وە لەئیبن عەبباس و جگەلەویش ، کەپێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەلای دووگۆڕدا
تێپەڕی فەرمووی : ئەم دووانە سزادەدرێن یەکێکیان لەبەرئەوەی خۆی لەمیزپاك نەکردۆ
تەوە ، ئەوی تریشیان لەبەرئەوەی دووزمانی کردووە ، پاشان داوای چلێکی دارخورمای کر
دوشکاندی وکردی بەدوولەتەوە هەرلەتەی لەسەرگۆڕێکیان دانا و فەرمووی: ئەوەسزاکەیان
کەم دەکاتەوە بەمەرجێك وشك نەبن٠
واچاکەخزم و کەس و کار لەنزیك یەك بنێژرێن هەتائاسانکاری بکرێت بۆکەس وکاریان کە
دەچن بۆسەردانیان ، هەربۆیەش دروستە نیشانەیەك لەسەرگۆڕی کەسەکانیان دابنێن تاگۆ
ڕەکانیان بناسنەوە و سەردانیان بکەن٠ئیبن ماجە دەگێڕێتەوە درودی خوای لەسەربێ گۆڕ
ەکەی عوسمانی کوڕی مەزعومی دیاری کرد بەدانانی بەردێك لەسەری٠وەلەگێڕانەوەکەی ئە
بوداود دا هاتووە ، درودی خوای لەسەربێ بەردێکی هەلگرتووەولەسەرسەری گۆڕەکەی دا
یناوە و فەرمووی : بەمە گۆڕی براکەم دەناسمەوە و کەس وکارەکانی خۆشم لای ئەنێژم٠
لەبارەی ئەوەی ئایامردوو خێری پێدەگات کەمندالەکانی بۆی دەکەن ؟ فەرمووودەهەیە لە
وبارەیەوە ، ئیمامی موسلیم لەصەحیحەکەی دا لەئەبی هورەیرەوە دەلێت : پیاوێك وتی :
ئەی پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) باوکم مردووە و وەسیەتی نەکردووە ئایا
ئەگەرچاکەی بۆبکەم پێی دەگات و دەبێتە کەفارەت بۆتاوانەکانی ؟ فەرمووی : بەلێ٠

**بنەچەی مرۆڤ :**

**زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کەمرۆڤی سەرزەوی بەو هەموو گەل و نەتەوەی جیاجیاوە لەچە ندمرۆڤێکی جیاوازەوە نەهاتوون ، بەڵکوهەموویان لەبەرەبابێکن ولەیەك ڕەگ وبنەڕەتەوە هاتوون٠هەتاڕۆژی دوایی هەرمنداڵێك لەدایك دەبێ لەنەوەی ئادەم و حەوایە٠**

**مەسەلەی هەبوونی مرۆڤی نیاندەرتاڵ دوورە لەڕاستی ، مرۆڤی نیاندەرتاڵ بوونی نییە مر ۆڤی کۆن و نوێ هەروەك یەك بوونە ، چونکە ئەگەرتەماشابکەین مرۆڤی نیاندەرتاڵ ناشیر ینترین شێوەی هەیە ، بەلاَم خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ : خودا بەجوانتر ین شێوە وێنەی کێشاون٠ئەمە قسەی مامۆستا (سەلام ناوخۆش)ە لەکتێبی ( سەربردەی ٢٥ پێخەمبەری نێوقورئان (علیهم السلام)٠**

**نەزانان دەڵێن هێلی پێشڤەچوونی مرۆڤ بەچەند نموونەیەك تێپەڕدەبێت ، کەئەمانەن :-**

**یەکەم : مرۆڤی مەیموونی ئەفریقی وەکوئەوەی (دارت)ی نەزان ناوی ناوە٠**

**دووەم - مرۆڤی جاوا :**

**گوایە شوێنەوارناسی هۆڵەندی (یۆجین دۆبوا) لەدورگەی (جاوا) پاشماوەی ئەومرۆڤەی دۆ زیتەوە ، دواتر لە(چین) لەساڵی (١٩٢٩) ئەوئێسکانە دۆزرانەوە ناوی لێنرا (مرۆڤی پەکین) ، کەوالەئەشکەوتێکی نزیك شاری پەکین دۆزرایەوە٠**

**سێیەم — مرۆڤی نیاندەرتاڵ :**

**هەندێ ئێسکی لاق ودەست لەئەشکەوتێکدا دۆزرانەوە ، کەدەکەوێتە ناوچەی (دۆسلدۆف)ی ئەڵمانیا و لەساڵی (١٨٥٦) بۆیەکەمجاردۆزرانەوە ، نەزانان ناویان لەوپاشماوانە نا مرۆڤی نیاندەرتاڵ٠**

**چوارەم : مرۆڤی کرۆماگۆن**

**پێنجەم : مرۆڤی عاقل**

**تاوان و سزا :**

**توندوتیژی وتاوان هەرلەسەرەتای بەشەریەتەوە هەبووە ، بەپێچەوانەی مارکس کەدەڵێ : توندوتیژی لەسەرەتای بەشەریەتەوە نەبووە٠چونکە خودای گەورە باسی ستەم وحەسو دی زۆرداری و بێ بەزەیی کوڕەکەی ئادەم دەکات ، کە(قابیل)ە ، کەچۆن دەستدرێژی کرد دەسەربراکەی وکوشتی٠ئیبن کەسیر لەتەفسیرەکەی دا دەڵێ : خودای گەورە ڕێگای بەئادەم دا (سەلامی خوای لێ بێ) کەکچەکانی لەکوڕەکانی مارەبکات لەبەرپێویستی ئەوکاتە ، وتو ویانە : حەوا هەرسکی دوومنداڵ کوڕێك وکچێکی دەبوو ، کچی هەرسکێك لەکوڕی سکەکە ی ترمارەدەکرا بەپێچەوانەشەوە ، خوشکەکەی هابیل ناشیرین بوو ، بەڵام خوشکەکەی قا بیل زۆرجوان بوو ، قابیل ویستی بیبات بۆخۆی ونەیدات بەهابیلی برای ، ئادەم (سەلامی خوای لێ بێ) نەیهێشت بیبات هەتا یەکی قوربانییەك نەکەن ، گوتی : هەرکەسێ قوربانی یەکەی لێ قبول کرا ئەوکچە بۆئەوبێ٠قوربانییەکە لەهابیل وەرگیراو لەقابیل وەرنەگیرا٠ ئیبن ئەبی حاتەم لەئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە : قەدەغەکرابوو کوڕوکچ بەیەك سك لەدایك بێ لەیەکتری مارەبکرێن ، هەموو سکێ دەبوو یەکێکیان کوڕبوو ئەوی تریان کچ بوو ، برای کچەناشیرینەکە گوتی : خوشکەکەتم لێ مارەبکە منیش خوشکەکەم مارە دەکەم لێت٠قابیل گوتی : نەخێرمن شایستە ترم بەخوشکی خۆم ، یەکێ قوربانییەکیان کرد ، قوربانی خاوەن بەرانەکە وەرگیراو قوربانی خاوەن کشتوکاڵەکە وەرنەگیرا وبراکە ی کوشت٠ئیبن کەسیرلەتەبەری نەقلی کردووە دەڵێ : سەنەدەکەی چاکە٠**{فطوعت له نفس قتل أخيه فقتله فأصبح من الخسرين} **واتا : (ئیتردڵی هات براکەی خۆی بکوژێ و کەوتە ڕیزی خەسارەتمەندانەوە)٠ (بڕوانە : تەفسیری ئیبن کەسیربەکوردی ، بەرگی دوو ەم)**

**لەلێدانی بوختانچی وزیناکەرومەی خۆردا نابێت لێدانەکە ببێتەمایەی ئێسك شکاندن و پێست لێبوونەوەوخوێن لەبەررۆیشتن ، دەبێ لێدانەکە ئازاری هەبێ ، بەڵام نابێ ئەوکە سەی لەکەسەکە دەدات بن باڵی ببینرێت لەفزی (جلد) واتا پێست واتا نابێ ئازاری لێدا نەکە لەپێستی تێپەڕێت وبچێت بۆگۆشتکەی وەنابێ لەدەم وچاوی بدرێ ، بەلکولەپشتی یان لەقاچی٠ئەو کەسەی شووی نەکردووە یان ژنی نەهێناوە سەد جەلدی لێدەدرێ ، ڕا**

**غبی ئەصفەهانی دەڵێ : ((زینا جووتبوونە لەگەڵ ئلفرەت بەبێ گرێبەستی شەرعی))٠**

**هەروەها دوورخستنەوەی بۆماوەی ساڵێك ، بەلاّم ئەگەرئافرەت بوو دوورخرایەوە دەبێ مەحرەمێكی لەگەڵ دابێ٠درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویەتی :** ((البكر بالبكر جلد ما ئة وتغريب عام)) أخرجه مسلم٠

**واتا : ((عازەب لەگەڵ عازەب لێدانی سەد جەلدەو دوورخستنەوەی بۆماوەی یەك ساڵ))٠**

**شەریعەتی حامورابی ، كە(١٨٠٠)ساڵ پێش میلاد داپڕشتووە ، ٢٨٢بەندی یاسایی لەخۆوە دەگرێت ، ئەویاسایانە زۆرتوندودڵڕەق بووە٠بۆنموونە ئەگەركوەیلەیەك لەڕووی كوڕی ئا زادێكی دا ئەوەگوێی دەبڕدرێت٠**

**ئەگەرسەرتاشێك بێ فەرمانی خاوەن كوەیلەكە قژی كوەیلەیەكی تاشی ئەوە قۆڵی ئەوسەر تاشە دەبڕینەوە٠**

**ئەگەركوەیەیەك بەئاغاكەی وت : تۆگەورەی من نیت ، ئەوەئاغاكەدەیبەستێتەوەوگوێی دە بڕێت٠**

**ئەگەركەسێكی ئازادسەروەتی كۆشكی دزی ئەوەدەكوژرێت٠**

**ئەگەرئاگرلەماڵی كەسێكی ئازادبەربوو ئەوكەسەی كەدەچێت بۆكوژاندنەوەی ئاگرەكە چاو ی خستەسەرماڵەكەوشتێكی هەڵگرت ئەوكەسە فڕێدەدرێتە ئەو ئاگرەوە٠ئەوەلایەنە خراپە كانی یاساكانی حامورابی بوو بەكورتی٠**

**مافی تەمبێكردن بەمەبەستی چاككردن ئەنجام دەدرێت وەك كاری پزیشكی بەمەبەستی چا رەسەری ئەنجام دەدرێ٠**

**١ – ئافرەت لەلایەن مێردەكەیەوە بەمەرجێك نەبێتە هۆی شكاندن یان برینداركردن٠**

**٢ – منداڵ لەلایەن دایك و باوكی٠**

**٣ – قوتابی لەلایەن مامۆستا٠**

**هۆشیاری یاسایی :**

**کەل و پەلی هاوسەرگیری : زۆرجارژن ماڵ بەجێدێڵێت و ناتوانێت کەل و پەلەکانی لەگەڵ خۆی ببات، سەردانی دادگای بەرایی دەکات بۆداواکردنی ئەم داوایە پێی دەوترێت:(**غصب أثاث الزوجية) **٠ ژووری نووستن کەل و پەل هی ژنەکەیە لەبەرئەوەی ئەو کۆمەڵە شتانە کەپیاوەکەی بۆی کردووە مانای ئەوەیە مێردەکەی پێی بەخشیوە ناتوانێت پەشیمان بێتە وە لەوبەخشینە بۆیە لەیاسادا کەل وپەلی هاوسەرگیری دەگەڕێتەوەبۆژنەکەوهی ئەوە٠بەلاّ م ئەگەرژنەکە لەگەڵ مێردەکەی لەخانوێکی سەربەخۆنەژیان تەنهامافی ئەوەی هەیەداوای ئەوکەل و پەلانەبکات کەلەژووری خۆیدان و بەسەربەخۆ بەکاریان دەهێنێت نابێت دەستد رێژی بکات بۆکەل و پەلەکانی دایك و باوکی پیاوەکەی ئەگەر ژنەکە لەیەك ماڵ لەگەڵیان بژیت ، بەڵکوتەنیا ئەوکەل و پەلانە مولکی ئەوە کەپیاوەکەی بۆی کڕیوە بۆنموونە ئەوکە ل و پەلانەی لەمارەیی پێشەکییەکەی کڕیویەتی یان وەکو دیاری تایبەت بەبۆنەکەی (حە فتیانە)بۆی هاتووە یان بەپارەی تایبەتی خۆی کڕیویەتی یان مێردەکەی بۆی کڕیوە، مافی بردنی هەمووکەل و پەلەکانی خانووەکەی نییە ئەگەرلەماڵێکی سەربەخۆلەگەڵ مێردەکە ی نەژیابوون٠**

**خزمایەتی :**

الرحمة لەزمانی عەرەبی دا واتا سۆزومیهرەبانی ودڵنەرمی ، (رحم) بەمانای خزمایەتیش دێ ، پاشان منداڵدانی ژن بەوە ناونراوە ، چونكە منداڵ دێتەدەر مرۆڤ دڵی بۆی نەرم دە بێت سۆزی بۆی دەجولێ٠

**جۆرەكانی خزمایەتی :**

**یەكەم – خزمایەتی باوك :**

خزمایەتییەكەلەڕێگەی هێڵی باوكەوەدروست دەبێت بەخزمایەتییەكی سەرەكی دادەنرێت٠ كوڕوكچ بەپلەی یەكەم دەچنەوە سەرڕێچكەی باوكەوە وەكوگەڕانەوەیان بۆخێڵی باوك٠

**دووەم – خزمایەتی دایك :**

خزمایەتییەكە لەڕێگەی خەتی دایكەوە دروست دەبێت٠

**سێیەم – خزمایەتی ژن و ژنخوازی :**

خزمایەتییەكە لەدەرەوەی خوێن و ڕەچەڵەكەوە دروست دەبێت واتا لەسایەی پڕۆسەی هاو سەرگیرییەوە دروست دەبێت ، ئەمەش پیاوبەخزم و كەسی ژنەوە دەبەستێتەوە وەكو : خە سوو ، خەزوور ، ٠٠٠هتد٠

(ع) دەڵێ : ((ئەگەرخزمێكمان خوێندوویەتی بووەبەپزیشك یان ئەندازیار یان جێوڕێیەكی باشی هەیە پێویستەبەوەخۆشحال بین و ئیرەیی پێنەبەین یان ئەگەركارگەیەكی داناوەوبە وە سەروەت وسامانێكی باشی كۆكردۆتەوە پێویستەئیرەیی پێنەبەین))٠

**کارکردن :**

**کارکردن بریتییه لەهەوڵ و کۆششی جەستەیی یان هزری ، کەمرۆڤەکان ئەنجامی دەدەن ئەگەرسەیری زانا و فەیلەسوف و ڕۆشنبیران بکەین شێوازی کارکردنی ئەوان هزرییە٠ بێگومان کارکردن گرینگترین هۆکاری جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی ژیانە ، خۆراك و جل و بەرگ و شوێنی حەوانەوەی پێدابین دەکرێت ، کورد دەڵێ : ((دەستی ماندوولەسەر سکی تێرە))٠**

**کارکردن ڕۆڵێکی گەورە لەبواری ئابوری و کۆمەلأیەتی و دەروونی دەگێڕێت :-**

**١ – وەرگرتنی دراو کەخەڵکی پێداویستییەکانی خۆیانی پێ جێبەجێ دەکەن٠**

**٢ – کاتەکان بەسەرڤالی بەڕێوەدەچن و کەسەکە هەست بەئاسوودەیی دەکات٠**

**٣ – دۆست و هاوڕێی تازەدایبن دەکات٠**

**٤ – لێزانی و شارەزایی دابین دەکات٠**

**(ش) دەڵێ : ((بەباشی دەزانم کارگە بکرێتەوە بۆئەوەی گەنجان لەوکارگانە هەلی کاریان دە ستکەوێت ، کەدەتوانێت ڕێژەی بێکاری کەم بکاتەوە٠کردنەوەی کارگەلەلایەن کەرتی تایبە تی و کەرتی گشتییەوە هەردووکەرتەکەم پێباشە دەتوانن خزمەت بەکۆمەڵگابکەن٠دروست کردنی کارگەڕۆڵی گەورەدەبینێت ، چونکە ئێستا زۆرێك لەدەرچووانی زانکۆ و پەیمانگاکان بێکارن))٠**

**(ه) دەڵێ : ((ڕووخۆشی کەسی بەرامبەرڕادەکێشێت بۆ دووبارەهاتنەوەی کڕیار٠فرۆشیارئە گەرڕووخۆش بێت کڕیاردێتەوەلای٠هەروەها قەناعەتی بەکەم هەبێت ، چونکەئەوکالأیانەی دایناون کەس ئامادەنییە زیاتری پێبدات لەکاتێکدا لەدوکانەکەی تەنیشتی هەرزانتربێت٠هە روەهادەبێ ئاگاداری کاتەکان بێت ، چونکەدوکان بەوەدەمرێت کەلەکات وساتی خۆی دانەکر ێتەوە ، نابێ کاتژمێر (١٠)ی بەیانی هەڵبسی بڕۆی ، چونکە کاتێك کڕیارەکەت بێت وتۆلەو ێ نەبیت دەچێت بۆشوێنێکی دیکە٠هەروەهادەبێ ئەوشتانەی لەدوکانەکەت هەن جیاوازبن بەپێی کات بۆنموونە سەوزەدەبێ هەربەشی ئەمڕۆبێنی ، چونکەئەگەردووسێ ڕۆژی بەسەر داتێپەڕی دەڕزی٠ئەگەرجل و بەرگ فرۆش بی دەبێ شتەکان هەربەشی ئەمساڵ بێنی ، چو نکەساڵێکی ترمۆدیلی نوێ دێت٠بەلأم ئەگەرفرۆشیاری شیش یان بلۆك یان پەڕاوگەت هەبێ**

قەلەم و کاغەز و دەفتەربفرۆشی زۆریش بن کێشەنییە٠ئەگەرکەل وپەلی کارەبایی بفرۆشی دەبێ شتی خراپ نەهێنی ، چونکە هەڵەکردن لەکارەباراستکردنەوەی مەحالە٠هەروەهاتۆد ەبێ خۆت بگونجێنی لەگەڵ کڕیارەکان ئەوکەسانەی دێنەلات هەیانە قسەی ڕەقە ، هەیانە وەسواسە٠هەروەهاپێویستەجگەلەزمانی دایك پێویستەزمانێکی دیکەش بزانی بۆنموونە کڕ یارێکی زۆری عەرەب دێنەلات بۆیە پێویستە زمانی عەرەبی بزانیت٠هەروەها دەبێ کەرە-ستەکان پۆلێن بکەی بۆئەوەی شوێنی هەمووکەرەستەکان بزانی وبەئاسانی پیشانی کڕیاربد ەی٠دەبێ ئاگاداری ئەوەبیت کامەکەرەستە زۆردەفرۆشێت پێش ئەوەی تەواوبێت تۆڕێژەیە کی زۆرت لەلابێت،چونکەلەکاتی نەمانی کەرەستەکانت کڕیارەکان بۆشوێنێکی دیکەدەڕۆن)) هەندێك جاربارودۆخ پاڵ بەمنداڵەوە دەنێت بۆکارکردن بەتایبەتی ئەومنداڵانەی کەڕووبە ڕووی لەدەستدانی بەخێوکەربوونەتەوە یان هەژاری ونەبوونی ئەمەش پاڵ بەبەخێوکەردە نێت بیخاتە بەردەم کارکردن٠هەندێك جاریش خێزانی منداڵەکە بەمەبەستی فێربوونی – پیشەیەك تابتوانێت داهاتووێکی باش بۆخۆی مسۆگەربکات٠زۆرێك لەخاوەن کارەکانیش بە شێوەیەکی زبرودڵرەقانە مامەڵە لەگەڵ ئەومنداڵانە دەکەن ، چونکە خۆی پێشتر بەهەمان شێوە ڕووبەڕووی مامەڵەی زبرودلڕەقانە وهەست بریندارکردن بۆتەوە لەلایەن وەستاکەی٠ ئەومنداڵە ڕۆژانە زیاترلەحەوت هەشت کاتژمێردەمینێتەوە لەگەڵ وەستاکەی بۆیە منداڵە کەکاریگەردەبێت بەخاوەن کارەکەی٠ئەوەی جێگەی مەترسییە هەندێ پیشە هەیەبۆنموونە قەسابی لەگەڵ دیمەنی خوێنڕشتن ڕادێن ، چونکەکارەکەیان بریتییە لەسەربڕین، بەردەوا بوونیش لەسەرئەوپیشەیە دەکرێت ببێتەهۆی ئەوەی کەخوێنڕشتن بەلای قەسابەوە ببێتە کارێکی ئاسایی بۆیەئاینی ئیسلام ناوهێنانی خوای داناوە لەسەرهەمووسەربڕاوێك بۆنواند نی نەرم ونیانی لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵ و پەلەوەردا٠

**تەوقەكردن :**

**(د) تەوقەكردن بەنیشانەی ڕێزگرتنی بەرامبەردادەنێت ، دەڵێ : بەبڕوای من تەوقەكردن دەربڕینی هەست و پەرۆشی خۆتە بۆبەرامبەرەكەت ، هەروەها دەڵێ : كچان لەجیاتی تەو قەكردن ماچكردن بەكاردەینن ، تەوقەكردنی سارد و سڕیش ئاماژەیە بۆ زویربوونی بەرا مبەرەكەت٠**

**(خ) دەڵێ : ((دووكچ كەیەكترماچ دەكەن لەوانەیە نەزەری زۆركوڕ ڕابكێشێت))٠**

**ئەمانەت :**

بریتییەلەدانانی شتێك لەلای کەسێك بۆماوەیەك و کەمتەرخەمی و خیانەتی لێ نەکات٠ بۆنموونە کەمتەرخەمی ئەوەیە کەسێك کتێبێکت بەئەمانەت لادابنێت ئەتووش بچی لە شوێنێکی وەها دایبنێی منداڵەکەت چەند پەڕەیەکی لێ بدڕێنێ یاخود لەشوێنێکی وەها دایبنێی باران لێی بدات٠بەڵکوپێویستە شتی ئەمانەت لەشوێنێکی پارێزراودابنێی بۆنمو ونە دانانی چاویلکەلەبن دۆشەك بەکەمتەرخەمی حیسابە بەڵکودایبنێی لەسەررەفەیەك یان لەناوسندوقێك دایبنێی تابیپارێزی لەشکان٠

**هیواکانی مرۆڤ :**

دەبێ مرۆڤ بەهیواوە بژی ، چونکە بوونی هیوا گرِوتین بەتواناکانی مرۆڤ دەبەخشێت٠هیو اکانیش جیاوازن بۆنموونە کەسێك لەبەندیخانەیە ئاواتی ئەوەیە رِزگاری بێت کەسانێکیش نەخۆشی قورسیان هەیە هیوایان چاکبوونەوەیە٠

(ع) دەڵێ : ((گەورەترین هیوا و ئاوات لەم ژیانە بیخوازین ئەوەیە خوای گەورە لێمان رِازی بێت))٠

(پ) دەڵێ : ((ژیانی مرۆڤ بریتییە لەکۆمەڵێك هیواوئاوات ، گەورەترین هیواوئاواتیش بە خۆشی ژیانە))٠

(ب) منداڵێکە دەڵێ : ((هیواوئاواتی من بووکەشووشەی جوانە بۆئەوەی لەماڵەوە یارییان لەگەڵدابکەم٠هەمووئێواران باوکم شتم بۆدەهێنێتەوە منیش بەرِاکردن بەرەوپیری دەچم ودەچمەباوەشی ، هەروەها حەزبەسواربوونی ئۆتۆمبێل دەکەم ، هەروەها دەمەوێ لەگەڵ منالأن یاری بکەم))٠

(ن) دەڵێ : ((هیواوئاواتی من بەخۆشی و شادی ژیانە))٠

(س) دەڵێ : ((سیساڵە کاردەکەم و نۆمنداڵم هەیە ئەوپارەیەی وەری دەگرم دەبێ کرێی خانووی پێدەم و خەرجی رِۆژانەمی پێدابین بکەم٠ئاواتم ئەوەیە خانوێك بکرِم ولەدەست کرێچیاتی رِزگارم بێ بۆئەوەی بتوانم ژیانێکی خۆش بەسەرببەم))٠

(ق) دەڵێ : ((ئێمەلەماڵەوە دوازدەسەرخێزانین هەربەتەنها من کاردەکەم دەبێت بەهەرجۆ رێك بێت پارەی کرێی خانوو و خەرجی رِۆژانەی ماڵەوە دابین بکەم ، سەبارەت بەخەون و ئاواتەکانم زۆرحەزدەکەم رِۆژێ لەرِۆژان باری ئابوریم باش بێ وبگەرِێمەوە بەرخوێندن ئە گەرئەوەش هاتەدی لەیەکێ لەدەزگا حکومییەکان دابمەزرێم))٠

(م) دەڵێ : ((تائێستاهیچ گۆرِانێك لەباری ئابوریم رِووی نەداوە ، خانووم بەکرێیە ئەوپارە یەی رِۆژانە دەستم دەکەوێت بەشی ١٠٠٪ی بژێوی ژیانم ناکات بۆکرێی خانوو هەرجارەولە یەکێك پارەقەرزدەکەم دواتربەشێوەی پچرِپچرِبۆی دەگەرِێنمەوە ، خەونم ئەوەیە خانوو ێکم هەبێت))٠

## گەنج وخۆرۆشنبیرکردن :

(ن) دەڵێ : ((گەنجی ئەمڕۆبایەخ بەکات بەسەربردن و بەکارهێنانی مۆبایل و ئینتەرنێت دەدەن ، لەئینتەرنێتیش دا وەنەبێ بەدوای زانیاری دا بگەڕێن ، بەڵکو زیاتربۆچاتکردن و ڕابواردن بەکاردێت))٠

(گ) دەڵێ : ((من وەکوگەنجێك هەمووکات لەهەوڵی بەدەستهێنانی زانیاری و شتی نوێمە جائەوزانیارییانەمێژوویی یان کۆمەڵایەتی یان زانستی بن٠هەردەم لەخەمی بەفیڕۆنەدانی کاتم ، چونکە کات گەڕانەوەی نییە کەچی بەداخەوە گەنجی ئەمڕۆ زیاتربەشتی لاوەکی و ڕواڵەتییەوە خەریکن ، قوتابی زانکۆیەڕۆژنامەیەك ناخوێنێتەوە بەشداری لەکۆڕوکۆبوونە وەیەکی ڕۆشنبیری و زانستی ناکات))٠

(ش) دەڵێ : ((کچی ئەم زەمانە ئەوەندەی بەزنجیرە تەلەفزیۆنی و دۆبلاژکراوەکانەوە خەر یکن هیچ گرینگی بەخوێندنەوەوتەماشاکردنی بەرنامەیەکی بەسوودنادەن ، ئەگەرچیرۆك یان ڕۆمانێکیش بخوێننەوە ئەورۆمانانە دەخوێننەوە کەباس لەخۆشەویستی دەکەن))٠

**قژڕەشکردنەوە :**

**قژڕەشکردنەوە حەرامە ، چونکەڕەنگی ڕەش نیشانەی گەنجی ولاوێتی یە ئەوکەسەش بەتە مەنداچووەوپرچی سپی بووە بۆیەڕەنگی ڕەش بۆپیاووئافرەت حەرامە٠ڕەنگەکانی دیکەش دەبێ ئەوجۆرانەبەکاربهێنرێ کەڕێگرنین لەگەیشتنی ئاوبۆپێست لەکاتی دەستنوێژشوشتن دا٠نابێ ئەوانەی گەنجیشن قژیان سپی بووە ڕەنگی ڕەش بەکاربێنن ، چونکە بەهۆیەوە ڕ- ێگەبۆکەسانی تریش خۆش دەکەن٠دەبێ هەمووشمان دان بەوڕاستییە دابنێین ، کەمرۆڤ لە قۆناغێکی دیاریکراوی تەمەندا ناوەستێ وگۆڕانکاری بەسەرجەستەوسیمای دادێت شاردنەوە ی پرچی سپی جۆرێکەلەجۆرەکانی هەڵخەڵەتاندن و ڕەنگەکانی تریش نابێ لەکاتی پڕۆسە ی خوازبینی کردن دا بەکاربهێنرێ٠**

**(ك) دەڵێ : ((بڕوای تەواوم بەقۆناغەکانی تەمەن هەیە ، قژڕەشکردنەوە باوەڕنەهێنانە بە قۆناغی پیری و هەلاٌتنەلێی))٠**

**(ش) دەڵێ : ((من لەگەڵ ڕەشکردنەوەی قژدانیم جا پیاوبیکات یان ئافرەت ، چونکە پرچی سپی جۆرە ڕێزێك بەمرۆڤ دەبەخشێ وادەکات جێگای سەرنج وڕێزی دەورووبەرەکەی بێ))**

**(ح) دەڵێ : ((دەتوانین بڵێین ئەوهۆکارانەی والەپیاودەکەن پەنا بۆ قژڕەشکردن ببات ڕازی نەبوونە لەمووی سپی ، کەنیشانەی هاتنی پایزی تەمەن دەگەیەنێت٠هەروەها بۆ گۆڕینی شێوەی دەم و چاووجوانیان پرچیان بۆیەدەکەن ، هەشەخێزانداره بۆهێنانی ژنێکی دیکە ئەوکارەدەکات ، پێم وایە ئەوکارەهیچ ڕۆڵ وکاریگەری نییە بۆچوونە نێوژیانی هاوسەری))**

**مێژوو :**

**مێژوو بەبوونی مرۆڤ لەسەرهەسارەی زەوی دەست پێدەکات٠وشەی مێژوو وتراوە لە وشە ی (ماە روز)ی فارسییەوە هاتووە ، ماە بەفارسی واتا (مانگ) ، (روز)یش بەواتای (ڕۆژ)٠ (مەقریزی) لەبارەی چەمکی مێژوو دەڵێ : ((هەواڵە لەبارەی ڕووداوەکانی ڕابردوو ، کەلە جیهان دا ڕوویان داوە))٠**

**ناصری سوبحانی دەڵێ : لەکتێبەمێژووییەکاندا بۆنموونە باسی یەکێك لەپاشاکان دەکات بۆ نموونە (١٠)دەساڵ پاشایەتی کردووە بەشێوەیەکی دوورودرێژلەبارەیەوە قسەدەکات بۆنموو نە دەڵێ : فلاَن سوڵتان ئەوەندە خۆراکی دەخوارد ئەم جۆرەقسانە بۆچی باشەوچ سوودێکی بۆئێمە هەیە ؟ بەلاَم قورئانی پیرۆز بۆنموونە حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێ بێ) نۆسەد و پەنجاساڵ بانگەوازی قەومەکەی کردووە ئەگەرتەواوی بەشەکانی ژیانی باس بکرێت هەر ساڵەولاپەڕەیەکی بۆدابنێین نۆسەدوپەنجالاپەڕەی دەوێت ، بەلاَم قورئان تەنیائەومەسائیلا نە دەگێڕێتەوە ، کەئینسان پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرێ٠بۆنموونە پلاندانانی حەزرەتی یوسف (علیەالسلام) کاتێك هەڵسا بەپلان دانان بۆحەوت ساڵی وشکەساڵی ، کەبریتی بوو لە یەدەگی گەنم٠**

**دایك و باوك :**

(ك) دەڵێ : ((من زۆرپەشیمانم لەوەی تاباوکم مابوو ڕێزم زۆرنەگرت ، بەخێوم نەکردوئا مۆژگارییەکانیم لەگوێ نەگرت٠باوکم مردولەکیسم چوو بۆیەزۆرپەشیمانم لەڕابردوو))٠

(ڕ) دەڵێ : ((پەشیمانم لەوەی دایك وباوکم زۆرهەوڵیان لەگەڵدام هەمووشتێکیان بۆدابین کردم بەگوێیانم نەکرد خوێندنم تەواونەکرد دڵی ئەوانیشم ڕەنجاندوخوێندنیشم لەکیس خۆمدا))٠

(ئا) دەڵێ : ((پەشیمانم لەوەی کەبەقسەی ژنەکەم دڵی دایکم ئازاردا ، لەکاتی خۆی دا لەخا نوودا لەیەکترجیابووینەوە ئێستاش دایکم کۆچی دوایی کردووە ، نازانم ئاخۆگەردەنی ئازا دکردوومە یان نا ؟ نەم توانی وەك پێویست بەخێوی بکەم و دڵیم ئازارداوە ، بەلآم ئێستا خێروخێراتی بۆدەکەم٠لەخوا(جل جلالە)دەپاڕێمەوە لێمان خۆشبێ))٠

**بۆچی کارەساتمان بەسەردێت ؟**

**١ – خوای گەورە بەندەکانی تاقیدەکاتەوە لەوناخۆشی و کارەساتانەی بەسەری دێت٠ئەم کا رەساتانەش دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوان ئەگەرمرۆڤ ئارام بگرێت ، یان پلەی زۆربەرزدە - بێتەوە٠**

**٢ – یان بەهۆی تاوانی بەندەوە خوای گەورە سزای دەدات بۆئەوەی ئەوبەندەیە هۆشیار – بێتەوە هەست بەتاوانەکانی بکات٠**

**زانیاری گشتی :**

★**جیاوازی** (الأبوین) **و** (الوالدین) :

(الأبوین) **لەوشەی** (أب) **وەرگیراوە** {ولأبویه لكل واحد منهما السدس} النساء : ١١

**باوك زاڵترە لەمەسەلەكەدا لەمەسەلەی میرات و ئەوجۆرە شتانە٠**

{ووصینا الأنسن بوالدیه احسانا حملته أمه كرها ووضعته كرها وحمله وفصله ثلثون شهرا} الأحقاف : ١٥

**الوالدین له** (الولادة) **ەوە هاتووە ، دایك زاڵتروديارترە لەمەسەلەكەدا ، كەئەویش چاكەكرد ن دەگرێتەوە ، كەدایك لەپێشترە وردەكاری تێدایە لەتەعبیراتەكاندا٠**

**ئایا ئەگەردایك وتی ئەوە بكە وباوك وتی مەیكە بەقسەی كامیان بكەین ؟**

★(سفینة) **له (سفن)ەوە هاتووە هەروەك ئەوەی كەشتی چەقۆ بێت و دەریاكە قاش بكات و توێكڵی لێ بكاتەوە٠**

★**تابووت له (التوب) هاتووە ، كەمانای گەڕانەوەیە كەدەبرێینەوە لای خوای تەعالا٠**

**(كان) لەعەرەبی دا بۆڕابردووە ، بەڵام لەقورئانی پیرۆزدا هەندێ جار بۆ ڕابردوو و ئێستا وداهاتووە :** {وكان الله على كل شیء قدیرا} الأحزاب : ٢٧

★الكوثر **له** (الكثیر) **ەوە هاتووە ، حەوزی كەوسەرە ، دروودی خوای لەسەربێ ئاوی لێدەدا تە بڕواداران٠**

★{وأما من خفت موزینه (٨) فأمه هاویة (٩) }

**ئەوكەسەی كێشراوەكانی كارە چاكەكانی سووك بێ ، دایكی ئەو هەڵدێرەكە لەهەڵدێرەكانی جەهەننەم٠**

**وشەی (أمه) بەمانای دایك نەهاتووە ، بەڵكو بەمانای لانەوجێگا٠**

★**شیخ الله :**

**ناوی (شیخ عبدالله قوتب ئەلەدار)ە ، بازاڕی (شیخ الله) بەناوی ئەوەوە ناونراوە٠**

★**وشەی خەلیفە له (خلف) هاتووە واتا (لەپشت) پێچەوانەی بەردەم یانی كەسێك لەدوای كەسێكی ترەوەبێ لەجێگەی كەسێك دابنیشێ٠**

٭ئەحمەدشەوقی (١٨٦٨ — ١٩٣٢) :
شاعیرێکی میصرِی یە ، ناسناوی ئەمیری شاعیران بووە٠
٭سیدارە :
کلاَوێکی لاکێشەییە لەئەسڵدا نەمساوییە پاشان ئیتاڵییەکان بەکاریان هێنا ، پاشان بووە کلتورێکی جیهانی٠لەجەنگی یەکەمی جیهانی ، کەئیتاڵییەکان هاتنە عیراق سیدارەیان نا ساند ، کەتوێژی ئەفەندییەکان لەسەریان دەنا ، مەلیك فەیسەڵیش لەسەری دەنا ، مامۆ ستاکانیش لەگەڵ چاکەت و پانتۆڵ لەبەریان دەکرد ، تاکۆتایی ساڵی پەنجاکان پاشان نەما٠ مەلیك فەیسەڵی یەکەم ، کەسەردانی ولاَتی ئیتاڵیای کردووە پێی سەرسام بووە ، پاشان کە هاتۆتەوە عیراق فەرمانی دەرکردووە ، کەدەبێ لەکاتی دەوامی فەرمی هەموو مامۆستاوقوتا بی وفەرمانبەرێك سیدارە لەسەربکات٠
٭کچی کافرۆش :
ناوی تەواوی (خەدیجە جومعە مەولوود)ە ، لەهۆزی شکاکە٠باوکی دوکانی کافرۆشی هەبوو لەکۆلاَنی سینەما سیروان ، لەساڵی سییەکان ئەفسەرێکی ئینگلیز تەماحی تێکردووە ، چەند جارێك داوا دەکات کە هاوسەرگیری لەگەڵ دا بکات ، بەلاَم باوکی رِازی نابێ بۆیە رِۆژێکیان ئەوکچە لەلای تەکیەی شیخ عبدالکریم دەرِفێنێ ودەیباتە بەرِیتانیا٠باوکی بەورِووداوە زۆر خەفەتباردەبێ وردە وردە هەردوو چاوەکانی لەدەست دەدا ودوای پێنج ساڵ کۆچی دوایی د ەکات لەسەروەسیەتی خۆی لەسەرمەیدانی شەقلاَوە دەنێژرێ٠
٭ئەحمەد تەبیب :
باوکی هونەرمەند فوئاد ئەحمەدە ، پزیشکی میللی کاری بەیتاری دەکرد ، ناوی تەواوی (ئە حمەد سلێمان خدر)ە لەساڵی (١٨٩٢) لەگوندی (بنەسلاَوە) لەدایکبووە ، لەساڵی (١٩٨١)کۆچی دوایی کرد ، لەهۆزی نانەکەلی یە٠
٭حەدیسی نەبەوی :
ئەوەیە ماناکەی دەخرێتە زیهنی درووودی خوای لەسەربێ و دەربرِینەکە هی خۆیەتی واتا لەرِووی مەفهوومەوە خواییە و لەرِووی دەربرِینەوە هی پێخەمبەر خۆیەتی٠

**★خوو :**

**بريتی يه لەڕاهاتن لەسەر ئەنجامدانی شتێك بەهۆی دووبارەكردنەوەی٠**

**★فەرموودەی موتەواتر :**

**واتا كۆمەڵێكی زۆرگێڕاويانەتەوە پلەی ئەوفەرموودەيەش دڵنيايی دەبەخشێت٠**

**★فەرموودەی (احاد) واتا يەك كەس ڕيوايەتی كردووە٠وشەی (أحاد) كۆی وشەی (أحد)ە بە واتای تاك دێت٠**

**★وشەی وەحی بێجگە لەوەی وەحی خوايە بۆپێخەمبەران ، بەڵام وشەكە بۆشتی تريش بە كارهاتووە وەك بۆ هەنگ :** { وأوحى ربك الى النحل أن اتخذي من الجبال بيوتا ومن الشجر ومما يعرشون} النحل : ٦٨

**خودا (جل جلاله) قسەی بۆهەنگ نەكردووە ، بەڵكو وەحييەكەی بۆهەنگ بريتييە لەوغە ريزەيەی خستوويەتييە ئەو باڵدارە٠هەرچی قورئانە وەحی كەلامييە وەحی قسەيە بۆپێخە مبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆئەوەی بەپێی ئەو وەحييە بجولێتەوە ،وەحی هەنگيش ئە وغەريزەيەيە بۆئەوەی پێی بجولێتەوە٠**

**★شەحن :**

**بارگاوی**

**★كۆڵەمەرگی : ژيانێكی نەدارانە**

**★كتێبی (جەماوەر مێگەلە) :**

**ئەم كتێبە هی كارل پۆپەرە ، ئەم نوسەرە باوەڕی بەبڕياری جەماوەر نييە ، چونكە دەڵێ : جەماوەر زۆروبۆرە بۆيە دەڵێ : ئەگەركۆمۆنيستەكان لەهەڵبژاردن سەركەوتن دەبێ ئێمە دژی پرنسيپەكانی هەڵبژاردن بوەستينەوە و بەسەركەوتنی كۆمۆنيستەكان ڕازی نەبين ، چونكە كۆمۆنيستەكان كۆمەڵگا دەڕوخێنن٠**

**★حەزرەتی يونس (سەلامی خوای لێبێ) زۆری لەگەڵ نەتەوەكەی خۆی هەوڵ دا ، بەڵام ئە وان لەسەربتپەرستی خۆيان بەردەوام بوون ، فەرمووی ئەگەر ئيمان بەزاتی خوا نەهێنن خوا سزاتان دەدات٠پاش ئەوقسانە بەتوڕەيی چووە كەناری دەريا لەوێ كەشتييەك لەسەر ڕۆيشتنە ئەويش سواردەبێ لەناوەندەی دەرياچەردەكەوێ كەشتييەكە قورسە دەبێ چەند كەسێك فڕێ بدەنەناودەريا ، چەند جاران ناوەكان دەنووسن هەرناوی حەزرەتی يونس دەر**

دەچێ یونس فڕێ دەدەنە ناودەریا دەکەوێتە ناوسکی نەهەنگ ، بەفەرمانی خوا نەهەنگە کە هیچی لێ ناکات لەناوسکی نەهەنگ لەڕۆیشتنەکەی پەشیمان دەبێتەوە کڕنۆش لەناوتار یکی زگی نەهەنگ دەبات نەهەنگەکە یونس فڕێ دەدات ، یونس دەگەڕێتەوە ناونەتەوەکەی دەبینێ وازیان لەبتپەرستی هێناوەوزاتی خوادەپەرستن زۆردڵی خۆش دەبێ٠

٭قەدەرییەکان :

ئەوکەسانەن قەدەردەدەنە پاڵ مرۆڤەکە خۆی ، نەوەك خوای خۆی پێیان وایە مرۆڤ خۆی ئەندازەوقەدەری کردەوەکانی خۆی خۆی دیاری دەکات نەوەك بەدیهێنەری بەمەش هەموو شتێك دەدەنە پاڵ ویستی سەربەخۆی مرۆڤ دوورلەویستی خوا (جل جلاله) جیاوازن بە قەدەرییەکان لەکاتێکدا نکۆڵی لەقەدەردەکەن٠

٭جەبرییەکان :

دەڵێن مرۆڤ ناچارکراوە سەرپشك نییە واتا کردارەکان دەدەنە پاڵ خوا (جل جلاله) پێیان وایە خوای گەورە کردەوەی بۆمرۆڤ داناوە و ئیجبارکراوە لەسەری پێویست کراوە کەدەبێت ئەم کردارانە هەربکات ، خوای گەورە دایناوە دەبێ ئەوکردارەهەربکات ، خوای گەورە داینا وە ، کەفلاَن ئەوکارە بکات و داشیناوە پاداشت وەربگرێت ، لەسەرفیساریش پێویست کراوە کەئەوخراپەیە بکات و داشیناوە کەسزابدرێت٠

٭سەلەف :

سەلەف لەزمانەوانی دا واتا (پێشین) ، بەلاَم لەزاراوەدا بریتییەلە : هاوەلاَن ، شوێنکەوتووان ، شوێنکەوتووی شوێنکەوتووان ، کەدرودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : (( خیرالقرون قرني ، ثم الذین یلونهم ، ثم الذین یلونهم)) رواه البخاری٠

٭ئیمان :

ئیمان بەچەند واتایەك دێت لەوانە :

١ — بەڕاست دانان

٢ — وتراوە لە (أمن) داتاشراوە واتا ئارامی و دڵنیایی ، پێچەوانەی ترس٠

ئیمان بریتییە لەبەڕاست دانان بەدڵ و دەربڕین بەزمان٠

ئیسلام بریتییە لەئەنجامدان بەئەندامەکان ، بریتییە لەخۆبەدەستەوە دان وملکەچ بوون٠

★خول (دور) :

بریتییه لەوەی دووشت هەن هەریەکەیان هۆکاری بوونی ئەوی تریان بێت ، وەك بوونی هێلکه بەنده بەبوونی مریشك ، بوونی مریشکیش پەیوەسته بەبوونی هێلکه٠

★ساڵی تیشکی :

بریتییه لەوماوەیەی کەتیشك دەیبڕێت لەساڵێکدا کەدەکاته نزیکەی شەش ملیۆن میل که تیشك بەئەندازەی (١٨٦٠٠٠) میل دەیبڕێت لەیەك چرکەدا٠

★ڕاڤەی ئایەتی : {يأيها الذين امنوا ءامنوا ان من أزواجكم وأولدكم عدوا لكم فاحذروهم وان تعفوا وتصفحوا وتغفروا فاءن الله غفوررحيم} التغابن : ١٤

واتا : (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوه بەڕاستی هەندێ لەژنان ومنداڵەکانتان دوژمنی ئێوەن جاخۆتانیان لێ بپارێزن ، ئەگەرلێیان ببورن و وازبێنن لێیان ولێیان خۆش بن ئەوابێگومان خواش لێخۆشبوو میهرەبانه)٠

ئەودوژمنایەتییەی لەم ئایەتەدا هاتووه دوژمنایەتی ڕق و کینه نییه بەرامبەربەیەکتر٠

ئیبن عەبباس وتوویەتی : ئەوەلەبارەی کۆمەڵێك پیاوی مەککەوەیه موسوڵمان بووبوون و ویستیان بۆلای پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) کۆچ بکەن ، بەلاَم ژن ومنداڵەکا نیان ڕێگربوون بۆلای پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بڕۆن٠

★ئیبن عەقیل :

ئەبولوەفا عەلی کوڕی عەقیل کوڕی محەممەد کوڕی عەقیل ساڵی(٤٣١)ی کۆچی لەبەغدا لەدا یکبووه خاوەن کتێبی (الفنون)ه٠

★ئیبن ئەسیر :

عزالدين ابی الحسن علی کوڕی محمد کوڕی عبدالکریم جزری ، ساڵی (٥٥٥) ی کۆچی لەجه زیرەی ئیبن عومەرلەکوردستانی تورکیا لەدایکبووه ، لەنوسراوەکانی : (الكامل في التاريخ ، أسد الغابة ، في معرفة الصحابة)٠

★فەراهیدی :

أبوعبدالرحمن خلیل کوڕی ئەحمەد فەراهیدی بەسڕی ساڵی (١٠٠)ك لەدایکبووه٠ بەیەکێك لەدیارترین زانایانی زمان و ئەدەبی عەرەبی دادەنرێت لەمێژوودا ، هەروەها بەدامەزرێنەر ی زانستی عەرووز لەقەلەم دەدرێ لەنوسراوەکانی : (العين ، العروض ، النقط والشكل)٠

**★خەتیب بەغدادی :**

**ئەحمەدی کوڕی کوڕی عەلی کوڕی سابت لەنوسراوەکانی :** (الرحلة في طلب الحديث ، تأ ريخ بغداد)٠

**★عومەرموختارعومەر :**

**ساڵی (١٨٥٨)م لەدایکبووە ، دژی سوپای ئیتاڵیاشەڕی کردووە ، ساڵی (١٩٣١) پاش بەدیلگرتنی لە (بنغازی) لەسێدارەدرا٠**

**★زوهری :**

**ئەبوموصعەب ئەحمەد کوڕی ئەبی بەکر قاسم کوڕی حارس کوڕی زوراره کوڕی موصعەب کوڕی عبدالرحمن کوڕی عەوف قوڕەیشی زهری یە ، ساڵی (١٥٠)ك لەدایکبووە٠**

★الشفاء :

**یەکێکەلەگرینگترین دانراوەکانی ئیبن سینا لەبواری فەلسەفەوحیکمەت دا لەدووتێی هەژدە بەرگ دا ، چواربابەتی لەخۆوە گرتووە :** (المنطق ، الطبيعيات ، الالهيات ، الرياضيات) **هەروەها** (القانون في الطب) **بەناوبانگترین کتێبەکانی ئیبن سینایە٠**

**★فەخرەددین ڕازی :**

**ناوی عبدالله محمدی کوڕی عومەری کوڕی حوسەین کوڕی حەسەن کوڕی عەلی فەخرەدد ین ڕازی یە لە (ڕاز) لەدایکبووە بەئەصڵ خەڵکی تەبەرستانە ، لەهۆزی تەمیمی بەکرییە٠ لەبەرهەمەکانی :** (الأربعين في أصول الدين)ە٠

**★شەهرستانی :**

**ئەبوفەتح محەممەد کوڕی ئەبی قاسم لەشەهرستانی نێوان نیساپوروخوارزم لەدایکبووە٠ لەنوسراوەکانی :** (الملل والنحل ، نهاية الأقدام في علم الكلام ، المنهاج والبيان ، تار يخ الحكماء)٠

**★قەشە ئۆگستین :**

**ساڵی (٣٥٤)م لەتانجای جەزائیری ئێستا لەدایکبووە ، ساڵی (٤٣٠)م مردووە٠**

**★سوفیانی سەوری :**

**أبوعبدالله سوفیانی کوڕی سەعیدی کوڕی مەسروق سەوری کوفی ، لەنوسراوەکانی :** (الجا مع الصغير ، الجامع الكبير ، الفرائض)٠

